# له په‌راوێزه‌كانی په‌روه‌رده‌ و فێركردنه‌وه‌


ئاماده‌كردنی

شنۆ یه‌حیا (شوارێ)

پێداچوونه‌وه‌ی

م/ غه‌ریب پشده‌ری


٢٠١٣

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **ناوی کتێب: لە پەراوێزەکانی پەروەردە و فێرکردنەوە**
- **ئامادەکردنی : شنۆ یەحیا (شواریٚ)**
- **پێداچوونەوە : غەریب پشدەری**
- **پیتچنین: شنۆ یەحیا (شواریٚ)**
- **نەخشەسازی ناوەوە: شنۆ یەحیا (شواریٚ)**
- **بەرگ: رێدار جەعفەر**
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم:** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانەی: موکریانی (هەولێر)**

- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٣) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە.**

MUKIRYANI

ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

**زنجیرەی کتێب (٧٦١)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێرست

## پێشکەشە بە /

**بەو یەکەم مامۆستایەی فێری ئەلف و بێی پەروەردەو فێرکردنی کردم .... !!!**

# سەرنج

لە دەرگادان وکردنەوە و چوونە ژووری هیچ لایەنێکی ژیان، هێندە سانا و بێ گرێ و گۆڵ و دڕك و داڵ نیە ، هەر کەسێك ویستی بە ئارەزوو و هەوا و هەوەس و حەزەکانی خۆی، سەری تێهەڵکا و هەنگاوی پان و پۆڕو هەراوی خۆی تێدا باوێ ... نەخاسمەش لایەنی پەروەردە و فێرکردن، کە بەردی بناغە و بنچینە و شەنگەستی پلە و پایە تۆکمە و پتەوەکانی ژیانە و هەمیشە دیاردەیەکی دیار و بەرچاوی هەنگاو و پێشکەوتن و بەردەوامی بەرەو پێشچوونی هەموو کات و شوێنەکانی دوێنێ و ئێستا و ئایندەی هەر نەتەوەو کۆمەڵگایەکە، چەند خۆشە بۆ ئێمەی کۆنترین نەتەوەی ئەم دنیاو مەرز و بوومەش ، لەمڕۆی ئەمڕۆی ڕەخساودا، هەریەکەمان لە ئاستی خۆیەوە، چاکی مەردانەی لی بکەین بەلادا و خەریکی هەڵنانی دیوار و دار و پەردووی ماڵێکی نوێی سەردەمیانەی ئاوەدان و زەنوێری خۆمان بین .

بەو ترووسکە ئومێدانەش شاگەشکەو خۆش و شادو شەنگوڵم، کە دەبینم نەوەی نوێ تۆوی غەمخۆری و دڵسۆزی و کاروکردەوە و بەرهەمی ناوازەیان لە

— زۆر لایەنەکانی ژیاندا — خەریکی چەکەرە و فراژوو بوون و چرۆ دەرکردنە، بۆ رازانەوەی گوڵزار و باغی ئیرەمی پێشکەوتنی ئەم وڵاتە بێ نازە ...

ئازیزان ...

کە لاپەڕەکانی ناو دوو تۆێی( لە پەراوێزەکانی پەروەردە و فێرکردنەوە)م تاوتۆێ کردو وەك حەزێکی پەروەردەیییانەی خۆشم بە ناو دێڕو لاپەڕەکانیدا گەڕام و زۆر بە وردی و بە سەرنجێکی قوولەوە تێڕامام، ئۆخژنم لە هەناوی هات و لە ناخەوە دەستخۆشی و ئافەرینی ئەو شۆخە مامۆستایەم کرد کە کتێبێکی ئاوا ناوازەی لە هەموو کوێرە ڕێیەکانەوە، بە شارێی ئەم پرۆسەیە ئاشناکردوونەوە و وەك چەپکە گوڵێکی ڕەنگین کتێبخانەی کوردی پێ ڕازاندۆتەوەو بۆتە چرای سەوز و پرشنگداری کتێبخانەی هەموو قوتابخانەکان .

ئازیزان/ پێتان وانەبێ دەستی ئەوەشی بۆ لەمل دەدەم کە بێ کەموکورتی و کەمایەسییە، یا خوانەکردە بڵێم لە هەموو بواران پەڕیوەتەوە ..بەڵام رێی ئەوە بەخۆم دەدەم بڵێم :سەرەتاو دەستپێکێك هێندە جوان وبابەتی وا تۆکمەو بەسوود و رێچکەیەکی ئەوتۆ جوان وفرە بابەتییانەی بەسوودی هەڵبژاردووە، کە بەراستی کەم وێنەن. خوا وێنەیان زۆرکات و قەڵەمی ئەو خاتوونەش هەر بەبڕشتتربێت .

غەریب پشدەری

٢ / ٩ / ٢٠١٢

# مامۆستای تازە

لــە چــایخانە بچــکۆلانەکەی ئــاوایی، هەرهــەموویان ســەبارەت بەمامۆســتای تــازە دەدوان... هەر یەکە قسەیەکی دەکرد بەبێئارامی چاوەڕوانی مامۆستای تــازە بــوون ... مەحموودی نالبەند گوتی:

- بابێ بزانین ئەو چی دەلێ ؟

سەبری تەڕە فرۆش وەلامی دایەوە.

-جا ئەوە دیارە ...ئەویش هەروەکو ئەوان قسەیەك دەکات: دەبێ ئێوەش یارمەتیمان بدەن...خەڵك چاوی لە دەستی ئێوەیە .

لەودەمەیدا دەرگای چایخانەکە کرایەوە تارمایی پیاوێکی باڵا بەرز وەدەرکەوت ... ئەوانەی لە چایخانەکە دانیشتبوون هیچ یەکێکیان لەجێگای خۆی نەبزووت... یەکێکیان گوتی .. هات... یەکێکی دیکەیان گوتی...بەڵی..هەر ڕاست خۆیەتی... پیاوە لاوەکە چەند خولەکێك لەبەر دەرکێ وەستا...لە نێوان دووکەڵی جگەرەکێشانی نێو ژووری چایخانەکەوە ڕوانی و گوتی

" سڵاو هاوڕێیان..."

ئەوانەی لەوێبوون هەر لە شوێنی خۆیانەوە وەڵامی سڵاوەکەیان بە "عەلەیکە سەلام "دایەوە ..."

مامۆستای لاو پرسی :

- دەڵێی میوانتان لێ خۆش نایە ؟!...

مەحموودی ناڵبەند لە جێگای خۆی بڵند بوو و وەڵامی دایەوە.

- فەرموون کاکی مامۆستا ...دۆست و بێگانە هیچ جیاوازییەکیان نییە ... فەرموون زۆر بەخێرێن...

مامۆستا لەسەر سەکۆی چایخانەکە لێی دانیشت... کوێخا لەبەری هەڵسا و گوتی.

- کاکە زۆر بەخێربێی ...

- زۆر سوپاس...

هەر وەکو چۆن هەواڵیان داوینێ کە ئێوە لاوێکی دڵفراوان و نیشتمان پەروەرن ...لەبەر خاتری خزمەت کردن بە وڵات، ژیانی شارتان وازلێهێناوە و ئاوایی ئێمەتان هەڵبژادووە .

ماموّستای لاو زەردەیەكی كردو وەلاّمی دایەوە :ـ

- هەركەسێ ئەو قسانەی كردبێ گـەورەیی نوانـدووە... پـێم وانییـە مـن هێنـدەش چاك بم .

مەحموودی نالّبەند وەلاّمی قسەكانی كوێخای دایەوە و گوتی :

- ئینشاللاّ هەرچییەكیان گوتبێ ڕاستە . تەنیا داوایەك كە لە تۆمان هـەبێ ئەوەیـە كە دواكەوتوویی نیشتمان و هەژاری و نەداری ولاّتەكەمان بەمندالّەكانمان نەلّێیت...

ماموّستای لاو زەردەیەكی هاتێ و وەلاّمی دایەوە .

دەمەوێ خۆشەویستی نیشتمان لە دلّ و دەروونیاندا زیندووكەمەوە، ئەگەر بتوانم لـەم ئەركەدا سەركەوم ئەوكاتە هەست بەئاسوودەیی دەكەم.

كوێخا چایەكی بۆ كاكی ماموّستا بانگ كرد و گوتی :

ئینشاللاّ سەركەوتوو دەبیت.

كاكی ماموّستا دوابەدوای ئەو درێژەی دایێ .

- لــە ولاّتەكەمانــدا سەرچــاوەی دەســت لیّ نــەدراو و دەرنــەهاتوو زۆرە... بــۆ بەرهەمهێنانی ئەم سەرچاوانەش دەبێ هەولّ بدەین، تا ئایندەی ولاّتەكەمان بە دەستی لاوەكان بنیات بنێینەوە، هەروەك چۆن باوو باپیرانمان بـە بەخشـینی خـوێنی خۆیـان ئازادی و سەربەخۆییان دەستەبەر كردو. ئەوان كە ئـەو ولاّتـەیان ئـاوا دامەزرانـدووە ئێمــەش دەبــێ ئــەم چــووزەرەیە گەشــەپێبدەین، بــۆ ئــەوەی ولاّتێكــی ئــاوەدان و دەولّەمەندتر بەنەوەی دوارۆژ بسپێرین...

پیرەمێردەكە لەسەر سەكۆی ئەوبەرەوە دانیشتبوو، بەدەنگە لەرزۆكەكـەی قسـەكانی كاكی ماموّستای بڕی. براله بەخۆڕایی خۆت ماندوو مەكە ...هەر تـۆ دەمـت لێـك

کردەوە ئێمە تێگەیشتین دەتەوێ چ بڵێیت. بـیروڕاو بۆچـوونەکانت زۆر چـاکن، بـەڵام کارپێکردنیان گرنگە ...لەبری ئەوەی نەوە بە نەوەی بسپێرن ئەگـەر دەسـتیان لـەناو دەستی یەکدی نابایە، بارودۆخ و گوزەرانی ئێمە زۆر لە ئێستا چاکتر دەبوو...

مامۆستای لاو بەسەر لەقاندنێك قسەکەی پەسەند کرد .

- راستە بابە گیان بەڵام چـاك کردنـی وڵاتێـك پێویسـتی بـەکات هەیـە ... دەبـێ ئێمە ...

کوێخا یەکسەر قسەکانی کاکی مامۆستای بڕی و پرسی:

- کاکی مامۆستا ئێوە تەمەنتان چەندە ؟.

- بیست و چوار ساڵ .

من هەفتاو پێنج سالّم ...کاتێك لەتەمەنی ئێوەدا بووم...زۆر لە ئێوە بـە هەسـت و سۆزترو بەکەف وکولْتر بووم، کە دوژمن وڵاتەکەی داگیرکردین، هەر هەموو دەستمان لەناو دەستی یەکدی ناو تا دوژمنمان لـە وڵاتـی وەدەرنـا ،...هـێێی ...هـەی.. ئەویش ڕۆژگارێك بوو ...ئێمە ئەو دەمەی هێشتا سمێلمان خەتی نـەدابوو. هـەر کـە پارچەیەکی وڵاتمان لە دەستی دوژمن ئازاد دەکرد، هێندەی دی بەکەفوکولْتر دەبووین، کـە هـەرخوا بۆخـۆی بزانێـت شـەو و ڕۆژ هـەدادانمان نەبوو...خـەوو خۆراکمـان لێ هەڵگیرابوو سوپاس بۆ خوا کارەکان بەرەوپێش چوون...کە دوژمن پێی لە وڵاتی بـڕا، کەوتینە بیری چاکسازی... یەکەمین بەرنامە کە بەلامانەوە گرنگ بوو دروسـتکردنی قوتابخانـە بوو...کاربەدەسـتانی ئیـدارە گوتیـان: ئێمـە بودجـەی دروسـتکردنی قوتابخانەمان نییە، دەبێت بۆ خۆتان قوتابخانەکە دروست بکەن ...خـەڵکی ئـاوەدانی قەزمە بەدەست وەخۆکەوتن. شەو و رۆژ کاریان دەکرد تا قوتابخانەکـە تەواوبکـەن...

کاتێك لە نێوان میللەت و دەوڵەت لێك تێگەیشتنی تەواو هەبێ ئەودەمی جیاوازی دەبەیندا نامێنێت و ئێمەو ئێوە باوی نامێنێت...گوتم:

" دروستکردنی قوتابخانە لەسەر ئێوە...ناردنی مامۆستاش لەئێمەوە... زۆری نەبرد مامۆستایان نارد و قوتابخانە کەوتە کار. ئێمە کە تازە لاوبووین دەستمان بەخوێندنێ کرد ئێمە لە مامۆستا بە کەفوکوڵتروو مامۆستاش لە ئێمە خۆش حاڵتر ...

کاکی مامۆستا لە نیشتمان پەروەرە گەرمو گوڕو گەرمە تەندوورەکان بوو، بەڵام لەکاتی وانەگوتنەوەیدا پتر وشەی (ئێمە) و(ئێوە)ی بەکار دەهێنا، هەمیشە دەیویست بۆشاییەك لەنێوان میللەت و دەوڵەتێدا دروست بکات... هەر لەناو وانەکەیدا ئاماژەی بەوە دەکرد کە چۆن دوژمن هاتۆتە ولاتی و (ئێمە) ش چۆناوچۆنمان لە ولاتی وەدەرناوە...ئەودەمانەی کە دەگەڵ دوژمنیدا پێکدا دەهاتین بێ ئەوەی خواردنێ بخۆین یان پشوویەك بدەین سینگمان کردبووە قەڵغانی سەرە نێزەی دوژمن...بەددان و نینۆك زۆرانبازیمان دەکرد...دەمانویست ئەوە بەجیهان نیشان بدەین کە دەتوانین بێ خواردن و بێکارکردن ژیان بەسەربەرین.تەنیا سەربەخۆو ئازادبین. دووبارە بە وشەی (ئێوە) دەستی پێدەکردەوە:

" دیارە ئەوڕۆ ناتوانین بڵێین ئەوەی کە دەمانەوێت دەستمان کەوتووە و پێی گەیشتووین... هێشتا لە زۆر شتی دیکەمان کەمە... فابریقەمان پێویستە ... ڕێگاوبانی چاکمان دەوێت... ئاوی پترـ تەندروستی پترمان پێویستە، ئیدی هەموو ئەوانە دەبێت(ئێوە) دروستیان کەن..ئێوەی لاوانی ولات دەبێت ئایندەی ولات بنیات بنێنەوە...

کاتێکی چوومە پۆلی دووەم باوکی خوالێ خۆشبووم پرسی:

- حاڵو باڵی قوتابخانه چۆنه ؟...

-خراپ نییه بابەگیان ...چاك دەڕوات...

- هەتا ئێستا چی فێربوو ون .؟

- دوو دانه هۆنراوەی نیشتیمانی و یەك سروود.

- هەر ئەوەندە؟

- شتێکی دیش، نەبوونی فابریقەو ئاو و تەندروستی و ڕێگاوبان و...

باوکم نێوچەوانی تێك ناو و پرسی:

- ئەی بۆ دروستی ناکەن؟

- چونکه مامۆستا هۆیەکانی پێ نەگوتبووین بۆخۆم پینەم کرد:

- لەبەر ئەوەی کەسمان نییه ...

- ئەدی چ بکەین ...کێ هەیه بێتو ئەوکارانه ئەنجام بدات؟

- دەبێت (ئێمه) له ئایندەدا ئەم کارانه ئەنجام بدەین...

- باوکم گورج لەجێگای خۆیەوه بڵندبوو و بەتووڕەییەوه گوتی:

- هەی سەگباب ...له بەیانییەوه تائێواره دەچییه قوتابخانه به ناخێری گیانت ئەو قسانەش دەکەیت؟ ئەوەتۆ سەتڵه ئاوێکت لەسەر بیرێڕا پێ نایەتەوه...ماڵی من جێی خواردن و نووستنێ نییه... باشه چ پەیوەندیەکی به تۆوه هەیه بچی فابریقەو ڕێوبانی بۆخەڵکی دروستکەیت ؟...

بەکورتیەکەی باوکم منی بردەوه سەرکاری شینایی بۆ زەوی کێڵان و باغەوانی...باوکەکانی دیکەیش ورده ورده منداڵەکانیان له قوتابخانەوه دەرهێناو بۆسەرکارێیان بردنەوه...هەر ئەو(ئێمه) و(ئێوه) گوتنانەی کاکی مامۆستای هەوەڵێ،

بـووه هـۆی داخسـتنی قوتابخانـەی ئاوایيەکـەمان، ئيسـتاش دوای چـەندين سـاڵ ئاواييەکەمان هەروەك ئەو ڕۆژەی لە دوژمنمان ئەستاندەوە دواکەوتوو و وێرانەيە. نـە ڕێ و بانێکمان هەيە ...نە ئـاو نـە تەندروسـتی و نەکشـتوکاڵ و نەپيشەسـازی ... هيچمان هەرنييە... پيرە مێردەکە بێ دەنگ بوو، مامۆستای تازە پرسی:

- منداڵەکانی ئاوايی هيچيان نەبوونە شتێك؟.

کوێخا وەڵامی دايەوە:

- بەدی! کوڕەکەی ڕەجەبی قەساب خولی سەرەتايی تـەواوکرد و گـوتی: باوکـە مـن دەمەوێ هەر بخوێنم تا ببمە پياوێکی گەورە...ڕەجـەبی قەسـاب ڕازی نـەبوو، بـەڵام دەروەستی کوڕەکەی نەهات ...چەند کەسێکيش ڕوويان لێ ناو ڕەجەبی قەساب ڕازی بوو کوڕەکەی بنێرێتە شاری بۆ خوێندنێ، لە وانەيە ڕۆژێك بێت و پياوێکی چاکی لێ دەرچێت و خزمەتی خەڵکی ئاواييەکە بکات...دوايەش يەك دوو کەسـی دی بـەدوای کوڕەکەی ڕەجەبی قەسابدا چوونە شاری...هەمووشيان خوێندنيان تەواوکردو تەنانەت بەپلەوپايەی بەرزيش گەيشتن بەڵام سوودی چييە..؟!

مامۆستای لاو کە بەچڕوپڕی گوێی بۆقسەکان شل کردبوو پرسی:

- هيچ کامێکيان نەگەڕانەوە ئاوايی و يارمەتی خەڵکەکەی بدەن .؟

کوێخا زۆر بە پەرۆشەوە سەرێکی لەقاندو گوتی:

- بۆ نايەنەوە ...هەموو ساڵێك وەختی هەڵبژاردنێ پەيدادەبنەوە ...ئينجا کە دێنەوە يەك دنيا پەيمانی مزروشيرين بە خـەڵکی دەدەن، هـەر مەپرسـە!. وتـاری بـەجۆش و خرۆش دەخوێننەوە و ئاو و تەندروسـتی و کارتـان بـۆ دابـين دەکـەين ... ڕێ وبـانی چاك...فابريقەی گەورە دادەمەزرێنين.." کاتێك کە هەڵبژاردنيش تەواودەبێت دەڕۆن

و هیچ کەس سەرو سەکوتیان نابینێتەوە... ئیستا کـاکی مامۆسـتا ئەگـەر ئێـوەش هاتوون هەمان قەوان بۆ خەڵکی لێدەنەوە و بڵێن" ئێوە ئـەی لاوەکـان چـاوی هیـواو ئومیدی دوارِۆژی وڵاتن و ئەو جۆرە شتانە، بەخۆرِایی خۆت ماندوو مەکەو بگەرِێوەو برِۆوە سەرکارەکەی خۆت، بەو کەسەش بڵێ کە تۆی ناردووە: کەسێکی دیکە بنێرێـت کە بتوانێت هەر خۆی ئەو کارانە ئەنجام بدات.

مەحموودی ناڵبەند دوا بەدوای قسەکانی کوێخا گوتی:

" کاکی مامۆستا ئێوە توورِە مەبن مەبەستمان ئێوە نییە لە تەواوی ئـەو ماوەیـەی کە هەر کەسێك هاتووە لە جیاتی ئەوەی کارێك ئەنجام بدات ئێمەی کردووەتـە تـۆپی فتبۆڵێ و پاسمان پێ لێ دەدات... ئەگەر هەر یەکێك بۆ خۆی کـەمێکی لـەو کارانـە ئەنجام بدایە ئەوە دەمێك بوو وڵاتەکەمان ببووە بەهەشتی بەرین ...[•]

---

[•]لە نووسینی / عەزیز نەسین

گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی ( ژمارە ٦٦) نیسانی ٢٠٠٦بڵاوکراوەتەوە.

# که جەرگمان لەزەوی دەخشێ

ن/ شوارێ

 لە وەتەی  ئەم گەردوونە کەوتۆتە چەرخەلە و گەڕان و سووڕان و شەو و رۆژ و مانگ و ساڵ و وەرزەکانی یەك بە دوای یەکدا بەدوای خۆیدا هێناوەو ئەم گۆی زەوییەی دەخۆوە گرتووە و بە رووەك و گیانلەبەر و ئادەمیزادی ئاوەدان و زەنویر کردۆتەوەو مرۆڤیشی تێداکردۆتە گەورە و کوێخاو دەمڕاستی هەرچی هەیە و نیە، کەچی دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سروشتێکی لێ راست کردۆتەوەو دەستەویەخە پەنجەو نینۆکی لە خنخنۆکی ئەو ئادەمیزادە گیر کردووە و ئەوك و بەرۆکی بەرنادا و لەو کاتەوە کەچاوی بەژیان هەڵیناوە و تا ئەمڕۆی ئەم چرکە ساتانە و تا ئەو رۆژەش کە ژیان لەسەر ئەم زەوییە خڕپلەییەدا بمێنێ ئەوە هەر دە بەربەرەکانێ و بگرەو بەردە و

گێرمەوکێشەدایە دەگەڵیدا، و هەر جارەی یەکێکیشیان کەم یان زۆر لە سووچ و کەلێنێکی ئەم سەرزەمینەدا لەو مل ملانێ و زۆرانبازییەدا وەبن یا وەسەر دەکەوێت، هیچ کامێکیشیان بە بردنەوەی کۆتایی ناگەن ... هەرچەندە بە لۆژیك و بە رووالەتیش هەر سروشت بەهێزو بالادەستتر دیارە دەو گوریس کێشەکییەدا، بەلام خۆ ئادەمیزادیش بە هێزو توانای هزرو بیرو مێشکی خۆی، هەروا دەستەوەستان و ملکەچ و چاوەڕێ دانانیشێ و لە پێناو بەردەوامی و مانەوەی خۆیدا، لەهیچ هۆ و هۆکارێك و لە هیچ مەترسییەك ناسڵەمێتەوە ، و نە هەر بەلەش و لارێکی ساغ و توند و تۆڵ و تەندروستەوە، بەڵکە بە شەڵ و کوێری و کەڕ ولاڵی و گێڕی و سەقەتیشەوە، واز لە کردە مرۆییەکەی خۆی هەر ناهێنێت و کلکە کەوگیرێکی لەلایەکی بنی مەنجەڵی ژیان هەر وەردەدا و جێ پەنجەو مۆرکی خۆی لەسەر دەنەخشێنێ.

ئادەمیزاد دەگەڵ قۆناغەکانی بەرەو پێشچوونی خۆی شان بەشانی کارەسات و رووداو و بەسەرهاتەکانی سروشتدا، هەمیشە لە چارە سەرو هۆکارو رێی بەرگری گەڕاوە ، تا هەر نەبێ باری ئەو هەموو شتە قورسانەی سروشت لەسەرشانی خۆی و نەوە و ڕەچەڵەك و تۆرەمەی خۆی سووك بکات ...

ئەوەتا ئێستا، هەر چەندە لە تەمەنی مێژوودا سالانێکی زۆریش نیە، بەلام وەك هەستی بەرپرسیاریەتی بەرامبەر ژیان، ئادەمیزاد ئاوڕێکی گەورەی لە هاو رەگەز و پێکهاتە مرۆڤایەتییەکەی خۆی داوەتەوە کە مەبەستە گرینگەکەی ئێمە بۆ پێشەکی باسەکەمان دەسەلمێنی :

لەزاو و زێ و زۆر بوونی هەموو زیندەوەرێکدا بە تایبەتی ئـادەمیزاد کـە ئەمـەیان تەوەری سـەرەکی باسـەکەی ئێمەیـە، هـەموو تاکـەکان وەکـو یـەك و بـە پێـوەری ئادەمیزادیبوون، بەیەك جۆر و شێوە و یەك پەیکەر و رەنگ و رواڵا و یەك تەندروست و حەز و ئارەزوو و بیرو بۆچوون، لە دایـك نـابن ، هەریەکـە و بـۆ خـۆی مرۆڤێکـی تایبەت و سەربەخۆیە و تایبەتمەندی و توانا و هێـزی جەسـتەیی و هزرییـان لەیـەکتر جیایە، بۆیە زۆر ئاشکراو روون و ئاریشەیەکی حاشا هەڵنەگرە، کە هەموو کەسێك — نێرومێ— زۆرجاران وەك ئادەمیزادێکی تەندروستی بێ گێرمەو کێشە نایەتە باوەشی ژیانەوەو لـەدایك نابـێ، هەیـە شـەل و سـەقەت و خـوارو خـێچ، یـا کـەڕ و لاڵ، و کوتروکوێر ، یا نەخۆش و کزو لاواز و وردیلەو ئیسقادار دێتە دنیاوەو لە دایك دەبێ، بەڵام دەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوانـەش مـرۆڤن و هێنـدەی خۆیـان بەشـێکن لـەو کۆمەڵو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین و ئەوانیش هەر خۆشەویست و ئازیز و لەبـەردڵ و سەنگی سەبووری دایك و باوکی خۆیانن و بە پەرۆشێکی زۆر زیـاترەوە دەتـوانم بڵـێم بەسینگ و بەرۆکی خۆیانیانەوە دەنێن و درێغی چاودێری و بەخێوکردنیان هەرگیز لـە هیچ لایەنەکانی ژیانەوە لێ ناکەن ... جا هەر میللەت و نەتـەوەو کۆمەڵگایـەك بـە گوێرەی پێشکەوتن و توانای باری ئـابووری و رۆشـنبیری و کۆمەلایـەتی ... هتـد ، خۆیانەوە بە دەنگ و هانای ئەم جۆرە ئـادەمیزادە، خـاوەن پێداویسـتیانەوە دەچـن و چەندی بۆیان بکرێ نایـەڵن ئەمانـەش لـەژیان دابـبڕێن و بکەونـە دەرەوەی جـوغزی جوانییەکان و ئومێدە رەنگاو رەنگەکانی ژیانەوە .

هەر بۆ ئەمەش و بەتایبەتیش لە وڵاتە خوا پێداو و پێشکەوتووەکان و زۆرێکیش لە ولاتانی ئەم رۆژهەڵاتی ناوینەش، بـۆ مەبەسـتی ئاوڕدانـەوە لـەو جگەرگۆشـەی کـە لەلایانـە هـاتوون بەرنامـەو پڕۆگـرام و پـەروەدەی هەمـە جـۆر و شـێوازی نـوێی

پەروەردەییيان دوای لێکۆڵینەوە و توێژینەوەو بەدواداچونێکی قووڵ و بەرین و هەراو داهێناوەو دەستیان بەجێبەجێ کردنی کردووە و تەنانەت ئەم باس و خواس و بەهاناوە هاتن و کار بۆ کردنی ئەم لایەنە ژیارییە لە بەرنامەوبڕیارو راسپاردەکانی زۆر بڕگەی یاسایی ئەنجوومەنی نێونەتەوەییدا کاری لەسەر کراوەو، وەك گوتمان زۆر لەپێش ئێمەومانانەوە هەنگاویان بۆ ناوە، یەکێك لەو هەنگاوە سەرەکییانەی لەم بوارەدا نراوە و ئیشی لێ کراوەو بەردەوامیش ئیشی لێ دەکرێ و بۆ دەکرێ، پەروەردەی پێش وەختە کە بریتیە، لە پشتگیری و پاڵپشتی کردنی هەر خێزانێکی منداڵی خاوەن پێداویستی تایبەتی تێدابێ، بۆ رێگە گرتن لە کەم تواناییەکانی ناو جەستەو پەیکەرەی درووستبووی منداڵەکە، کە هەر لە یەکەم رۆژی لەدایکبوونیەوە دەست پێدەکات و کەموکووڕی و ناهەمواریيە جەستەیی و هزرییەکانی لێ دیاری دەدا، ئەوەش لە رێی ئەو بەرنامە دارێژراو وهەڵسەنگێنراوانەوە، کە بۆ منداڵەکە دەکرێت و لەرێی فێرکردنی ئەو کارامەییيە پەروەردە نوێیانەشەوە کە فێری خێزانەکەو منداڵەکەش دەکرێن. ئەوەی خێزانیش لەم بوارەدا فێری دەبێ یا فێر دەکرێ ئەوەیە، کە چۆن ژینگەیەکی لەبار و گونجاو و سەرنج راکێش بۆ منداڵەکانیان فەراهەم و دابین کەن. بۆ ئەم مەبەستەش، دەبێ خێزانەکان — ئەوانەی منداڵی خاوەن پێداویستی تایبەتییان هەیە — لەکاتی کردنەوەی هەر خولێکی مەشق و راهێنان لەسەنتەرەکانی سەر بەم بەرنامەیە ئامادەبن، کە پەروەردەی تایبەت ئامۆژگاری خێزانەکانی تێدا دەکات و هەر ئەو پەروەردەیەش هەفتانە سەردانی ماڵەوەی خێزانەکان دەکات، بۆ پێدانی زانیاری دەربارەی چۆنیەتی گەشەکردنی منداڵەکانیان و چۆنیەتی هەڵس و کەوت و چۆنیەتی کۆنترۆڵ کردنی ژیانی منداڵەکانیان.

یەکێك لە لێکۆڵینەوەکانی ئەم بوارە، دەریخستووە کە ئەو پشتگیری و مەشق و راهێنان و فێرکردنانە، یارمەتی ئەو خێزانانە دەدەن تا کۆتایی ژیانیان هاریکاری منداڵەکانیان بن. ئەو فێرکردن و مەشق و راهێنانانەش بریتین لە چۆنیەتی هەڵگرتن، لەبەر و باوەش کردن، شووشتن و تەڕ و وشککردنەوە، خەواندن، خواردن و خواردنەوە پێدان بەشێوەیەکی زانستیی و پەروەردەییانە، کە هەموو ئەمانەش دەبنە هۆی کەم کردنەوەی فشار و بار سووکی خێزان. هەر لە رێی ئەم پرۆگرامەشەوە خێزانی وا راهێنراوە کە بتوانێ توانستی گرینگ فێری منداڵەکانیان بکەن.

نەتەوە و مەرزو بوومێکی وەك ئەم کوردستانە رەنگینە و ئەم کوردە بێ وەیەی ئێمەش کە وەك زۆر و ستەم لێکراوێکی مێژوو، هەمیشە هەر ژێر چەپۆکەی دەستی ناحەزان و چاو چنۆك و زۆرداران و پێشێلی ئەسپی سوارەی داخ لەدڵ وکینە دۆزان بووە و مێژوو شاهیدە کە نەخۆی و نە خاکەکەی تا ئێستا نەبووە و رێك نەکەوتووە ماوەی چەند ساڵێکان بەدوای یەکدا هەناسەی حەسانەوەیەکی هەڵکێشابێ و ئۆخە و ئۆخژنی دەدڵی گەڕابێ.

دیارە وڵات و نەتەوەیەکیش هەمیشە لە ململانێ و زۆرانبازی و شەڕی بەردەوامدا بوو بێت و خاکەکەشی گۆڕەپانی ئەو شەڕانەی شەرخواز و درندانە بووبێت داخوا چ کارەساتێکی تێدا قەوماوە و چ پاشماوەیەکی وێرانکاری و تالان و بڕۆ و کوشت وکوشتار و شەل و کوێر و سەقەت و بریندار و شێت و شبرو نەخۆشی دەروونی و کەساسی و کلۆڵی و بێدەرەتانی بەدوای خۆیدا بەجێهێشتووە، هەر بۆیە لەو روانگەوە دەتوانین بڵێین یەکێك لەو وڵات و نەتەوانەین کە پێویستیەکی راستەوخۆو تەنانەت

زۆر بەپەلەشمان بە پرۆگرام و بەرنامەی کاری پۆرتاج (پەروەردەی پێش وەخت) و پەروەردەی تایبەت هەیە، کە وەك زنجیرەیەکی نەپساوە ئەڵقەکانی هەر لەسەرەتای لەدایکبوونی کەسانێکی خاوەن پێداویستی تایبەتەوە ، تا مردنیان پێویستیان پێیەتی ، کە پەروەردەی تایبەتیش ئەڵقەیەکی ئەو زنجیرەیەیە بۆ خاوەن پێویستیە تایبەتییەکان . لە خوێندنی بەرفراواندا کە ئەویش بریتیەلە:

خوێندنی منداڵی کەم توانا — جا هەرچی کەم تواناییەك بێت — لەناو قوتابخانە ئاساییەکان و دەگەڵ قوتابییە تەندروست و ساغەکاندا ، ونابێ جیابکرێنەوە و دەبێ شان بەشانی هاوتەمەنەکانیان بخوێنن و فێربکرێن و فێربن . ئەمەش هەروا لەخۆوە ناڵێین ، توێژینەوە نێو دەوڵەتییەکان سەلماندوویانەکە منداڵی کەم توانا بەم رێگایە باشتر فێردەبێت. ئەمەش بە پشتگیری و هەوڵ و کۆمەکی هاوبەشی نێوان خێزان و قوتابخانە و کەسانی بەرپرسی ئەم بوارە ، تا بڵێی کاریگەر دەبێت و دەرەنجامێکی شایستەو دڵخواز بە دەستەوە دەدا.

بەلای خوێندنی بەرفراوانەوە ، هەموو منداڵێك وەك خودی خۆی لە منداڵێکی دیکە جیایە وجیاوازییە کەسییەکانی تایبەتن بەخۆیەوە و هەموو منداڵێکی خاوەن پێداویستی تایبەتیش لەدیدی خوێندنی بەرفراوانەوە توانای فێربوونی هەیە و زۆریش ئاساییە کەمنداڵ بەشێواز و بڕ و رێژەی جیاواز بێت.

یەکەمین شوێن، قوتابخانە بەرپرسی فێرکردنی هەموو منداڵێکە ئەویش بە پێی توانا و لێهاتوویی و ئامادەگی منداڵەکە، چونکە گوتمان جیاوازی تاکەکەسی (فروق فردیە) لەم پرۆسەیەدا رۆڵ دەبینێ. هەروەها هیچ قوتابخانەیەکیش بۆی نیە منداڵێك

ڕەتکاتەوە، لەبەر ئەوەی خاوەن پێداویستی تایبەتە، بەڵکە دەبێ داوای هاریکـاری و پشتگیری بکەن لە بەشی پەروەردەی تایبەت و هانای بۆ بەرن بەدەنگیانەوە بچێ.
هەربۆیەشە پەروەردەی تایبەت لەسەریەتی پێداویستیەکانی هەر منداڵێکی کەم توانا تاوتوێ بکات و هەڵیسەنگێنێ و، تا دەتوانێ زانیاری دەربارەی هەر منداڵێکی کـەم توانا بەگوێرەی بارودۆخی کەمایەسییەکانی کۆبکاتەوە .

ئەوەندەی لەسەرەوەش باسمان کردووە هەمووی لەسەر بنەماو شەنگستـی دەستووری عێراقی و ژمارەیەك پەیڕەوە نێو دەوڵەتییەکانە، کـە ئـەوەیان دەستنیشـان کـردوون هەموو منداڵێك مافی خوێندنی هەیە. ئەگەر هاتو منداڵ کەم توانایی جەستەیی یان هەستەکانی ( بیستن و بیـنین ) ... هتـد ، هـەبێت ئـەوە هـەر دەبـێ وەك هـەموو منداڵانێکی دیکەی ئاسایی مافی خوێنـدنی هـەبێت. چـونکە خوێنـدنی بـەرفراوان مانای وایە کە : نابێ منداڵی خـاوەن پێداویسـتی تایبـەت لـە دەرەوەی قوتابخانـەی ئاساییدا بێت.

جا هەر بەوپێ و دانگەش، پێمان خۆشە ئاوڕێك وەلای قوتابخانەکاندا بدەینەوەو بزانین دەبێ چبکەن و چۆن بن :
دەست نەنێن بەڕووی هیچ منداڵێکەوە — هەر چۆنێك بن — ولە قوتابخانەکاندا وەریان بگرن و، کاتێکیش منداڵی کەم توانا لەهەر قوتابخانەیەکدا تۆمارکرا، ئەو قوتابخانەیە دەبێ داوای هاریکاری و پشتگیری لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی ئەوشوێنە بکات .
لەسەر قوتابخانەکانیشە هانی منداڵانی دیکە بدەن پێشوازی لە مندڵانی کەم توانـا بکەن. و وەبیر مامۆستاش بهێنرێتەوە کە مامۆستا بەرپرسـیاری فێرکردنـی هـەموو

قوتابییەکانی ناو پۆلەکانن و بەچاودێری پۆلەکانیش رابگەیەنرێت کە لەژێر چاوەدێری مامۆستادا ئاگایان لە منداڵە کەم توانایەکان بێت .

لێرەوە بۆ پشت قایمی و راستی و دروستی باسەکەمان و بۆ ئاگاداری و خستنە بەرچاوی خوێندەوار و لایەنی پەیوەندیداریش پێم خۆشە هەندێك یاسا و بنەمای ئەم پرۆسەیە بخەمە بەرچاو، کە لە یاسا نێودەوڵەتییەکانی مافی کەم ئەندام و کەم تواناکان( خاوەن پێداویستیە تایبەتییەکان ) ە. ژمارەیەك یاسای تایبەتی کە لە ئەنجومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە سەبارەت بە مافی کەم ئەندامان دەرچووە :

- بڕیاری ٣٠٥ ساڵی ١٩٥٠ز دەربارەی گێڕانەوەی ئامادەگییە کۆمەلاتییەکانی کەم ئەندامانی لەش و لار.
- بڕیاری ٢٥٤٢ ساڵی ١٩٦٩ ز دەربارەی هەستانەوەو گەشە کۆمەڵایەتییەکان و پاراستنی مافی کەم ئەندامانی باری ئەقڵی و لەش و لار.
- بڕیاری ٢٨٥٦ ساڵی ١٩٧١ ز دەربارەی مافی کەسانی کاڵ فام.
- بڕیاری ٣٤٤٧ ساڵی ١٩٧٥ دەربارەی مافی وەکو یەك بوونی کەسە کەم ئەندامەکان دەگەڵ مرۆڤی دیکەی ئاساییدا.
- بڕیاری ٣٢/٣١ ساڵی ١٩٧٦ بە جاڕدانی ساڵی ١٩٨١ ز بەساڵێکی نێو دەوڵەتی بۆ کەسانی کەم ئەندام.

- بڕیاری ٥٢/٣٧ ساڵی ١٩٨٢ ز دەربارەی بەرنامەی کاری جیهانی پەیوەست بەکەم ئەندامانەوە، جگە لەوەش جاڕدانی ماوەی نێوان ساڵی ١٩٨٣ و ساڵی ١٩٩٣ بە ( دە ) ساڵی جیهانی کەم ئەندامان.

- بڕیاری ٤٩/٤٨ ساڵی ١٩٩٣ ز دەربارەی یەکرێسایی بۆ هێنانەدی دەرفەتی وەکو یەك بۆ کەم ئەندامان .

ئەمانە و زۆر شتی دیکەی وڵاتە دراوسێیەکانی ئێمەش، کە گرینگییەکی زۆر بە پەرۆشانەیان بەم پرۆسەیە داوە و یاسا و رێسای زۆریان بۆ پشتگیری و جێبەجێ کردن و بایەخ پێدان ، دەرکردووە و نەیانهێشتووە کەلێنێك و درزو دەلاقەیەك بکەوێتە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا و نەتەوەکانیانەوە .

خودا نەیبڕێ هەرچەندە ئێمەش زۆرنیە راست و چەپی خۆمان لەم بوارەدا ناسیوەو ئاوڕمان لە پێداویستی لایەنێکی گەورەی غونچە سیس و ژاکاوەکانی باغی سەر سەوزو زەنوێری کۆمەڵگاکەمان داوەتەوە، بەڵام ئەو هەنگاوانەی بەسۆز و دڵسۆزی و پەرۆشی بە پەرۆشانەوە، بەرێوەیە، زۆرنابا ئێمەش دێینە ریزو ریزبەندی غەمخۆرانی مرۆڤی خۆمان و هەموو مرۆڤایەتی سەر ئەم ڕووی زەمینە. بۆیە لێرەوە بە پەرۆشێکی یەکجار بەخۆ راپەرموونەوە دەنگ هەڵدێنم و دەڵێم، گەلۆ ئەو چاوگەش و نەمامە شلك و ناسك و نازدارە دڵ پڕ لەخۆزگەو ئاوات و هیوا بەژیان و ڕاماو لە ئاسۆی ئایندەیەکی گەشدا، چاوەڕێی هیمەت و چاکی بەلاداکردنی مەردانەی ئێمەن، ئاسانکاری خوێندن و پێداویستییەکانیان بۆ دابین بکەین، چونکە ئەوانەش هەر مرۆڤی ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتین و چاویان لە دەست و پەنجە و سۆزی ئێمەیە،

بەســەری بــێ نازییانــدا بێــنین و نازیــان بکێشــین و ئێمــەش دەبــێ لەئاســتی ئــەو چاوەڕوانیانەیاندابین ... بۆ ؟

چونکە ، ئەوانە سفت و سۆی ئەو ئازارەن (( کە جەرگمان لە زەوی دەخشێ )) *

---

* ن / شوارێ/ لە رۆژنامەی خەباتی ژمارە (٢٩٩٦) لەبەرواری ٢٠٠٨/١١/١٤ لاپـەرەی کاروبـاری کوردستاندا بڵاو کراوەتەوە.

سەرچاوەکان :


١- جريده النهار ( العدد ١٨٤ – ٠٥ / ٢٠٠٩/١٠ )

٢-سایتی( http://www.bintt.net/vb/showthread.php p=568047.)

٣- تعليم الآبناء / ( تربية و تعليم ) ( معارف متعددة ) الاربعاء ٢٧/مايو /٢٠٠٩

٤- ملتقـــــى التربيـــــة الخاصـــــة : أخبـــــار أقســـــام التربيةالخاصـــــة http://www.aljobran.net/showthread.php

٥- گۆرینی دیدی فەلسەفیمان بۆ مـرۆڤ بنـەمای گۆڕانکارییەکانەلـە سیسـتەمی پـەروەردەو فێرکردندا / راپۆرتی کۆتایی کۆنگرەی پەروەردەی ٢٠٠٧

٦- الشرق الاوسط / جريدة العرب الدولية / الاحد / ١٧/ شعبان ١٤٢٧ ه ١٠سبتمبر ٢٠٠٦ العدد (١٠١٤٨)

٨-مديرية التربية و التعليم بمحافظة السويس/ الخطة الاستراتيجية لتطـوير التعلـيم بالسـويس ٢٠١٢/٢٠٠٨

٩- صحيفة الوقت / العدد ١١٢٧ الاثنين ٢٦ ربيع الاول ١٤٣٠ ه /٢٣/ مايس / ٢٠٠٩

# شەنەبایەكی خەرمانی پەروەردە

**ن/ شواریێ**

شتێكی بەڵگە نەویستە كە پێشكەوتن و دەركەوتن و گەشەی هەر گەل و نەتەوەو وڵاتێك بە پێوانەی ئەندازەی بەرز و نزمی ئاستی رۆشنبیری وخوێندەوارییانەوە بەندە و، هەر لە دوورەوە لە سیما و روخسار و ئاكاریاندا دەردەكەوێ، كە لە چ قۆناغ و پلە و پایەیەكی پێشكەوتندان .

گەلانی دنیاش هەریەكەیان كە (گەلی كوردیش یەكێكە لەو گەلانە ) بە گوێرەی ئەو هەل و دەرفەتانەی كە بۆیان هەڵكەوتووە و یا ئەو بارودۆخەی — زۆر یان كەم — بۆیان رەخساوە، بەردێكیان خستۆتە سەر بنچینە و بناغەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی و جێ پەنجەی خۆیان بەسەر دیواری هەڵچووی ئاستی پێشكەوتنی ئەورۆی ئادەمیزادەوە ناوە. هەرچەندە ئەمەش لە شەو و رۆژێك و ناوەختێكدا و بە كتوپڕی نەهاتۆتە دی، بەڵكە سەدان و هەزاران ساڵی خایاندووە و قوربانی زۆری لە پێناودا دراوە، تا رۆژی

بەو ڕۆژە گەیاندووە و ئەوڕۆ بەرو میوەی درەختە مێژووییەکەی کۆڵنەدان و بەردەوامی دەچنێتەوە.
ئێمەی کوردیش، هەر لە سەرەتای پشکوتنی چاوی مێژووەوە، لەگەڵ زۆربەی گەلانی ڕەسەن و ڕەگاژۆی سەر ئەم گۆی زەوییەدا هەبووین و تا ئێستاش کە هەین و هەر دەشبین، درێغیمان لە هاوبەشی بنیاتنانی شارستانیەتی و ژیاریی گەلانی جیهاندا نەکردووە و هەر بەردەوامیشین، ڕەنگە ئێمە خۆمان بە زۆرلێکراو و سەرکوتکراوی ژێر چەپۆکی زۆر گەلانی خاوەن هێزو تواناو زۆردار و چاوسوور بزانین و لە زۆربەی قۆناغە مێژووییەکانی ژیانماندا دەرفەتی ئەوەمان بۆ نەڕەخسابێ وەك هاومرۆڤەکانی دیکەمان بێینە سەر شانۆی ژیان و ڕۆڵی خۆمان پێشانی دنیا بدەین، بەڵام وا وردە وردە ئێمەش بە هەنگاوی پتەو و بەردەوام و خێرا لەم سەردەمەی ئێستاماندا هاتووین چاکی مەردایەتی لیٚ بکەین بەلادا و دەرد و ئێش و ژانە ناسۆرەکان و داو دەرمان و هەتوانی نەخۆشی و برینەکان دەستنیشان کەین.
هەر بۆیەش ئەم چەند پەیڤانەی سەرەوەشم کردنە دیاری، تاکو لێیەوە کەلێنێك بدۆزمەوەو بچمە ناو حەوشەوبان و حەساری پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنەوە، کە بەلای منەوە سەرەتا و کۆتایی، هەموو پێشکەوتن و سەرکەوتن و دەرکەوتنێکی هەر گەل و نەتەوەو وڵاتێکە ... هەرچەندە دەستم بۆ بوارێکی زۆر سەخت و دژواریش بردووە، بەڵام پەرۆشیم وای لێکردم نەسلەمێمەوە بۆیە وامن لێرەوە و لە دوو تۆێی ئەم چەند لاپەڕەو نێوان ئەم دێڕانەوە، هاوبەشی و بیر و بۆچوون و سەرنج و پێشنیارەکانی خۆم لە بواری چاکسازی سیستەمی پەروەردە و گۆڕانکارییەکانی بەرنامە و پرۆگرامەکاندا دەخەمە ڕوو، هیوادارم دارێکم لەسەر بەردێك دانابێ و هاوبەشییەکی

خاکەڕایانەم لەلایەنە ئەرێنییەکاندا بەو چەند خاڵانەی خـوارەوە کردبـێ، خـۆ ئەگـەر نەشمتوانیبێ زیانێکم نە گەیاندووە:

١- (چاکسازی یا گـۆڕانی هـەر بەرنامـەی کارێـك یـا پرۆگرامێـك، بـە گـۆڕانی تاکەکانەوە بەندە و گۆڕانی تاکەکانیش دوو جۆرە گۆڕانن کە دەبێ لە تاکەکاندا هەبن یا دروست بن:

* **جۆری گۆڕانی یەکەم** : ئەوەیە کە تاك دیدو تێڕوانینی بەرامبـەر دەوروبەرەکـەی بگـۆڕێ و بزانـێ هەسـت بـە چـی دەکـات و چـاوەڕێی چـیە. کـە ئەمـەش دیـاردە زانستییەکانە .

* **جۆری گۆڕانی دووەم** : ئەمەیان گۆڕانی دیاردە هەڵچوونە پڕ کەفوکوڵەکانە. هەر بۆیە لەوانەیە مامۆستا هەست بە گرینگـی و پێویسـتی ئـەو گۆڕانـە بکـات بـەڵام رەفتارێکی وا نانوێنێت یا کارێکی وا ناکات ببێتە هۆی گۆڕان).

٢- لە هەر پرۆسەیەکی چاکسازی و گۆڕاندا دەبێ مامۆستا هانبدرێ لەسەرخسـتن و بەرەو پێشچوونی پرۆسەکەدا، چونکە یەکـەمین کەسـێکە کـە هەسـت بـە گـۆڕان و کاردانەوەی گۆڕانەکان بکات و دەستنیشانی لایەنە چاك و خراپەکانی هەر پرۆگرامێك و گۆڕانکارییەك بکات و ببێتە هۆی چەسپاندن و جیبـەجێ کردنـی هـەر پرۆگـرام و بەرنامەی کارێك. چونکە هەر کاتێـك مامۆسـتا هەسـت بـە پەراوێزخسـتن و گـوێ پێنەدان و فەرامۆشکردنی خۆی بکات، هەڵوێسـتی بەرامبـەر تەنانـەت ئەرکـەکانی خۆشی دەگۆڕێت نەك هەر چاکسازی و گۆڕانکاری .

٣- پێکەوە کارکردن: دەبێ دروشمان پێکەوە کارکردن بێت لە پرۆسەی پـەروەردەو و فێرکردندا لە هەرێمی کوردستان. ئەویش بە شێوەی هاریکاری و کاری گرووپی و بـە

تێکەڵی هەردوو ڕەگەزی نێر ومێ (ژن و پیاو یا کچ و کوڕ) چونکە کارەکە دەبێتە کارێکی هەرەوەزی و کراوە نەك تاکە کەسی و داخراو .

٤- پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن — وەك سیستەمێکیش — پەیوەندی راستەو خۆی بەتاك تاکی ئەندامانی هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵگاوە هەیە، جا هەر لە مامۆستاوە تا دەگاتە قوتابی و دایك و باوك و بەرێوەبەری قوتابخانە و سەرپەرشتیاران و کادیرانی پسپۆر و شارەزایانی تایبەتی ئەم بوارە، بۆیە دەبێ هەر هەمووومان وەك پەنجەکانی هەر دەستێك هاریکاری و هاودەنگی و بەشدارییەکی راستەوخۆ و بێ گرێ و گۆل و ماندوو نەناسانەی تێدابکەن .

٥- ئەم پرۆسەیە، چونکە پەیوەندییەکی راستەوخۆ و بێ پێچ و پەنای بەکار و بیری ئازاد و سەربەست و دیموکراسییانەوە هەیە، نابێ لە هیچ قۆناغێکیدا دەرگای پرس و ڕاگۆڕینەوەی لەسەر دابخرێت و مەیدانەکەی بەرتەسك بکرێتەوە .

بۆیە دەبێ چ دامودەزگا حوکومییەکان و چ دامەزراوە پەروەردەیی و فێرکردنەکانی وەك قوتابخانەکان (بەهەموو قۆناغەکانیانەوە و لە هەرپلەیەکیاندا) ببنە شوێنی بیرکردنەوەی ئازاد و دەربڕینی سەربەخۆ و ڕاستەوخۆ نەك شوێنی نوێ کردنەوەی ترسەکان و گەورەکردنی شەرمەکان .

٦- ئاگادار کردنەوەی پێش وەختی مامۆستایان، لە گۆڕانکاری و گوڕینی پڕۆگرام و بەرنامەی کاری خوێندنی کتێبی قوتابخانەکان، بە کردنەوەی خولی تایبەت بە گۆڕانکارییەکان و دەستنیشان کردنی گونجان و نەگونجانی ئەو گۆڕانکارییانە و چۆنیەتی چارەسەرکردن و لابردنی ئەو ئاستەنگانەی بۆ مامۆستا دەبنە مایەی دژواری و دەردە سەری .

٧- هاوكات لەگەڵ گۆڕانكاری و چاكسازییەكانیشدا هەر لەناو جوغزی پڕۆگرام و بابەت و سیپارەكانیشدا خول نەخۆین، دەبێ ستراتیژیەتی كارەكانی خۆشمان بەرەو لای بیناكردنی نەوەیەكی نوێی ئەو تۆوە بەرین، كە هەر هەمان وێنەی مرۆڤەكانی دوێنێ و سەد دەر سەدی ئەوانەی ئەوڕۆش نەبن، چونكە كۆمەڵگای كوردەواری وا تازە خەریكە دەكەوێتە سەرپێ و لە هەموو بوارەكاندا بە تایبەتی بواری پەروەردە و فێركردن، هەنگاو بەرەو چەسپاندنی دێموكراسییەت دەنێ، بۆیەش دەبێ لە پێش هەموو بوارەكاندا، بواری پەروەردە دێمواكراسیترینی هەموو بوارەكانی تری ناوكۆمەڵگا بێت .

٨- مامۆستاش دەبێ هۆكارێكی كاریگەری هێنانە دی ئامانجە پیرۆز و مەبەستە لە مێژینەكانی خاك و نەتەوەكەی بێت و باوەڕی تەواوی بە (دێموكراسی و ئازادی و مافی مرۆڤ) هەبێ و دەبێ ئەوەشی لەلا ڕوون بێت كە هیچ شتێك وەك خۆی چەق بەستوو نامێنێتەوە و بەردەوام لە گۆڕان و گۆڕانكاری دایە .

٩- لە چاكسازی و دەستكاری پرۆگرام و بەرنامەی كارەكانیشدا، واچاكە لیژنەیەك لەسەر ئاستی وەزارەت و بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنی و بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەكان پێك بهێنرێت، بۆ بەدوا داچوون و چاودێری كردنی كەموكوڕی و لایەنە چاك و خراپەكان و چارەسەركردنی خاڵە لاوازەكانی كارەكان .

١٠- بۆ چاكسازی و بەردەوامبوونی بەرنامە و پرۆگرامەكانی خوێندن و، چنینەوەی بەروبووم و بەرهەمەكانی ماندوو بوونی هەموو لایەك، واچاكە یا لیژنەیەك یا دیوانێكی وەرگێڕان لە وەزارەتی پەروەردەدا دابمەزرێت و هەموو توانایەكی ماددی و مەعنەوی بخرێتە بەردەست و بابەت بۆ هەموو قۆناغەكانی خوێندن — هەر لە خوارەوە تا دوایین پلە — لەسەرچاوەی دوور و نزیكەوە لەبەرچاوبگرن، كە لەگەڵ باری

میللەتەکەی ئێمەدا بگونجێ و، وەریان بگێڕنە سەر زمانی کوردی، بۆ ئەمەش دەبێ سوودی راستەوخۆ لە ئەدیب و نووسەر و زمانزان و مرۆڤی کارامە وەربگیرێ و لە وەرگێڕاندا هەر پشت بە پسپۆرانی بابەتەکان نەبەسترێ و بەس، چونکە ئەوان بابەت زانن، نەك زمانزان !

١١- تەتەڵەکردن و لەسەرەد و بێژینگدانەوەی زۆری و بۆری و چرووپری بابەتەکان و نەگونجانی زۆرینەیان لەگەڵ پێداویستی هەندێ قۆناغەکانی خوێندندا و هەوڵی زیادکردن و فەراهەم کردن و بەکارهێنانی هۆیەکانی فێرکردن و ئامادەکردنی کادیری لێهاتوو بۆ ئەو بوارە، کە گەورەترین پێویستی سەردەمن لە پرۆسەی خوێندن و پەروەردە و فێرکردندا .

١٢- پێداچوونەوە، بژار و ساغکردنەوەی زۆربەی زۆری بابەتەکانی خوێندن، کە پڕن لە هەڵەی زانستی و زمانەوانی و رێنووسی ستاندارد، بۆیە دەبێ لەگەڵ هەر هەنگاوێکی چاکسازی بابەتەکانی خوێندندا، ئەوشتانە رەچاوبکرێن کە ئاماژەمان کردۆتێ .

١٣- سالآنە ناردنی مامۆستایانی لێهاتوو و بەزیبك و زاکوون و چاپوك و زانا و زیتەڵە بۆ دەرەوە، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی لەسیستەمی خوێندنەکانی ئێمەوە نزیکن، تا ببنە بەردی بناغەی تەلاری خوێندنێکی سەردەمیانە و ئەوانیش لەناوخۆی وڵاتدا سوودیان لێ وەربگیرێتەوە .

١٤- دانانی دامو دەزگایەکی پێشکەوتووی پەروەردە و فێرکردن و بەرێوەبردنی لە لایەن کادیری شارەزا و پسپۆڕی بواری پەروەردەو فێرکردن و دەستەو دایەرەیەکی دلسۆز و غەمخۆر، تا نەبێتە ناوی گەورەو دێی وێران .

١٥- ڕەچاوكردنی داد پەروەری لـە نێـوان مامۆسـتایاندا و هانـدان و و ڕێزگـرتن و دەستخۆشـی كـردن لـەو مامۆسـتایانەی هـەوڵ و تێكۆشـان و مانـدوو بـوون و بەرهەمەكانیان بەرجەستەو دیارن .

١٦- بەرزكردنەوەی ئاستی دەروونزانی و لایەنی زانستی و زمانەوانی مامۆسـتایان، ئەویش بەوەرگرتنیان لە كولێژی پەروەردەو پەروەردەی بونیاد، تا مامۆستای شارەزا و ئاست بەرز لە بوارە تایبەتییەكەی خۆیاندا بەرهەم بهێنرێن .

١٧- نەهێشتنی بەكارهێنانی هەموو جۆرە مەلزەمەیەك و وتنەوەی وانەی تایبـەتی لە دەرەوە و ناوەوەی قوتابخانـە و ماڵـە خواپێـداو و دەسـت ڕۆیشـتووەكاندا، ئـەدی قوتابخانەو پرۆگرام و بەرنامەی كار و ئەو هەموو مامۆستاو خەرجیانە لە پێناو چـین، ئەگەر ئەو دیاردە دزێوانەی سەرەوە هەبن ؟!

١٨- هەڵسەنگاندنەوە و تاقیكردنەوەی ئەو مامۆسـتا لاوازانـەی ئەركـەكانیان لـە ڕووی ئاستی فێركردن و پەروەردەدا پێ بەڕێوە ناچێ، یا لە و ئاستەدا نین، لە پرۆسەی پەروەردە و فێركردن دوور بخرێنەوە، یان خولی تایبەتییان بۆ بكرێتەوە و فێـر بكـرێن چۆن خۆیان فێردەكەن .

١٩- ژمارەی وەرگرتنەوەی مامۆستایان لە كۆلێژەكاندا زیاد بكرێت و مامۆسـتایان هان بدرێن ڕووبكەنەوە خوێندنی باڵاتر .

٢٠- سـاڵانە وەك نموونـەی كارچـاكی و چـالاكی پیشـەی مامۆسـتایەتی ڕێـز لـەو مامۆستا چالاك و ماندوو نەناس و خاوەن بـەهرەو داهێنەرانـە بگیرێـت، كـە كـاری ناوازە دەكەن لە پرۆسەی پـەروەردەو فێركردنـدا و ناویـان وەك نموونـەی مامۆسـتای سەركەوتوو بەسەر تێكڕای قوتابخانەكانی وڵاتدا پەخش بكرێت تا ببنە پێشـەنگ بـۆ ئاواڵەكانیان .

٢١- هەوڵدان بۆ پتەو کردنی پێوەندی نێوان قوتابخانەو ماڵی قوتابی، فێرکردن و ڕاهێنانی دایك و باوکەکانیان لەسەر چۆنیەتی بەرەو پێشەوە بردنی منداڵەکانیان لە سیستەمی نوێی پەروەردەو فێرکردندا یا لە پرۆسەی چاکسازییەکاندا .

٢٢- پێداچوونەوە بە شێوازی وەرگرتنی قوتابییان لە (مەڵبەندی وەرگرتن) دا و ڕەچاو کردنی خواست و ویست و حەز و ئارەزووەکانیان لە هەڵبژاردنی ئەو شوێنەی دەیانەوێ پسپۆری و شارەزایی تێدا بە دەست بێنن و بەرەو ئەو ئاواتانەوە بچن کە حەزیان لە هێنانە دییەتی. چونکە بە پێچەوانەی ئەمەوە دەبێتە هۆکاری نزمبوونەوەی ئاستی زانستی قوتابییان و هەموو ماندوو بوون و خەرجی و تەمەن و هێز و وزە و توانا هزری و ڕۆشنبیرییەکانیش تێکڕا بەفیڕۆ دەچن . •

---

•بە دووبەش لە ڕۆژنامەی خەبات لاپەڕەی پەروەردەو خوێندن بڵاو کراوەتەوە

– ژمارە (٣٥٨٣) لەبەرواری ٢٠١٠/٩/٢٦

– ژمارە (٣٥٨٩) لەبەرواری ٢٠١٠/١٠/٣

# چۆن منداڵەکەت بۆ یەکەمین جاری چوونە قوتابخانەی ئامادەدەکەیت؟

گومان لەوەدا نیە کە فێربوون شتێکی بنەڕەتییە لە ئایندەی منداڵدا، هەر بۆیە کەسوکار هەمیشە لە چوونە قوتابخانەی منداڵەکانیاندا بۆ قوتابخانە دوو دڵن و لە دڵەڕاوکێدان، هەمیشەش دەیانەوێ منداڵەکانیان بەرنە باشترین قوتابخانە تا تێیدا نایابترین و بەرزترین وانە فێربن. بەڵام زۆر جارانیش ئەوە بەلای کەسوکارەوە گران دەکەوێتەوە کە چۆن منداڵەکەیان رازی بکەن بچێتە قوتابخانە .

ئا لێرەدا هەندێ هەنگاو و ئامۆژگاری هەن یارمەتیت دەدەن لە هەڵس وکەوتتدا دەگەڵ ئەو منداڵەی کە یەکەمجاریەتی ئامادەی چوونە قوتابخانەیە و دوو دڵی چوونە ناو ئەو ئەزموونەشەو نایەوێ بچێت :

خوشكی بەڕێز ..........

- پێش كرانەوەی دەرگای قوتابخانەكان و دەست بەوانە خوێندن كردنـێ، منداڵەكـەت بەرە و بەیەكەوە بچنە قوتابخانەكەی بۆی دەچێ، تا بە تەواوەتی هەموو جێیەكانی ناو قوتابخانە دەبینن و شارەزای دەبن، تا لە دواییدا منداڵەكە شوێنەكەی بەلاوە ئاسـایی بێت و نامۆیی لێ نەكا.

هەوڵ بدە منداڵەكەت شوێنە هەرەگرنگەكانی ناو قوتابخانەكە ببینێ .

- بە دوور و درێژی باسی ئەوە بۆ منداڵەكەت بكە كـە هـەر لەیەكـەم ڕۆژی چـوونە قوتابخانەیەوە چی ڕوو دەدات و بارودۆخ و گوزەران چۆن دەبێ، لەگەڵ لەبەرچـاوگرتنی ئەو راستییەش كە یەكەمجاری چوونە قوتابخانـەی منداڵەكـە و سـەرەتای قۆنـاغێكی تازەیە لە ژیانیدا و، ناتوانێ لە مێشكی خۆیدا لێكیداتەوە داخوا بارودۆخ و گوزەران چۆن دەبێ. دەتوانی بۆ خۆت لەگەڵ منداڵەكەتدا باسی چۆنیەتی بەسەربردنی ڕۆژانەی خوێندنی ناو قوتابخانەی بۆ بكەیت و، یارمەتی ئەوەی بدەی و وای لێ بكەی بۆ خۆی بـارودۆخ و گـوزەرانی قوتابخانـە لـە مێشـكی خۆیـدا وێنـا بكـات. ئـەوەش بزانـە كەمنداڵەكەت وێنەی هەموو شتێك لە خەیاڵ و بیرو مێشكی خۆیدا دروست دەكات، هـەر بۆیـە باسـكردنی یەكـەمین رۆژی خوێنـدن لەگـەڵ منداڵەكەتـدا، ئـەزموونی یەكەمجاری چوونە قوتابخانەی لە ژیانـدا زۆر لـەلا ئاسـان دەكـات و كـەش و هـەوای خوێندنی تا ڕادەیەك لەلا خۆش و ئاسان دەبێ

- هەندێك پرسیاری دیاریكراو لە منداڵەكەت بكە تا بۆ خۆی بتوانێ هەلوێستەكانی ناو قوتابخانە لە مێشك و خەیاڵی خۆیدا بێنێ و بەرێ . هەر بۆ نموونـە دەتـوانی لـە ناخۆشترین بەش ولایـەنی سـەخت و گرانـی یەكـەمین جـاری چـوونە قوتابخانـەی لێ بپرسی، هەروەها دەشتوانی ئەو شتانەشی لێ بپرسی كە لە یەكەمین جاریـدا تووشـی

دوو دڵی و دڵە ڕاوکێی دەکەن لە چوونە  قوتابخانەی . هەروەها دەتوانی دەربارەی ئەو شتانەشی لێ بپرسی کە لە یەکەمین جاری چوونە قوتابخانەیدا چاوەڕێیان دەکات و لـە ژیانیدا حـەزی لێیانـە، کـە کـەش و هـەوای خوێنـدنی تـا ڕادەیـەك لـەلا ئاشـنا و خۆشەویست  دەکا .

- هەوڵبدە منداڵەکەت وا ڕابێنی بەر لەوەی ڕۆژی چوونە قوتابخانـەی بێـت، شـەوانە زوو بنوێت و ( بخەوێت ). بۆ نموونە دەتوانی کاتێکی دیاری کراو بۆ نواندنی شەوانەی منداڵەکەت دیاری بکەیت بەر لە دەست بە خوێندن کردنێ بە هەفتەیەك دوو هەفتە .
 هەوڵبدە (١٥) پازدە خولەك لە جاران زووتر منداڵەکەت لە خەو هەستێنی و داواشی لێ بکەی شەوانە (١٥) پازدە خولەك زووتر لە جاران بچـێتە نـاو نـوێن و سـەرجێی نووستن .

- دەتوانی هەوڵی سەردانی پۆلی خوێندنی منداڵەکـەت بـە رۆژێـك بـەر لـە دەسـت پێکردنی خوێندنی وانەکان بکەیت تا منداڵەکەت هەنـدێ هەسـت بـە ئاسـوودەیی و دڵنیایی و هەست بەوە بکات کە هەندێ سەر و ڕووی ئاشـنا  دەبینێـت. خـۆ ئەگـەر منداڵەکەت تەنانەت هەندێ ئاشناو رۆشناو ناسیاوی منداڵیشی هەبوون، دەبێ هـانی بدەی هاوڕێ و دۆست و ناسیاوی تازەی دیکەش بگرێ .

- ڕێی منداڵەکەت بدە با هەندێ لەوشتە سادە تایبەتییانەی یەکەمین جـاری چـوونە قوتابخانەی بۆ خۆی هەڵبژێرێت. هـەر بـۆ نموونـە ئەگـەر پاکـەتێکت بـۆ شـتومەکی خواردنێ بۆ لەبەرچاوگرتبوو وازی لێ بێنە با بۆخۆی نەخشە و ڕەنگەکەی هەڵبژێری و دیاری بکا دیسانەوە هەر بۆ نموونە ئەگـەر ویسـتت کـەل وپـەل و پێداویسـتییەکانی قوتابخانە بۆ منداڵەکەت بکڕی، دەتوانی وازی لێ بێنی بۆخۆی لەگەڵ تۆدا کەل وپـەل و پێداویستییەکانی هەڵبژێرێ تا هەست بەوە بکات کە ئەویش خاوەن بڕیارە .

- بەرلەوەی بچنە قوتابخانە زۆر باش بیر لە ماڵئاوایی و خوا حافیزی منداڵەکەت بکەرەوە کە بۆ یەکەمجار لە قوتابخانەیدا بەجێدێڵی. ئایا ئەو ماڵئاوایی و خودا حافیزیە هەروا بە خێراییەکی زوو تێدەپەڕێت یان هەروا بۆ نموونە پێنج دەقیقێکانی بەلاوە دادەنیشی.

- هەندێك کتێب و چیرۆکی دەربارەی چوونە قوتابخانەی یەکەمین جار بۆ منداڵەکەت بخوێنەوەو بگێڕەوە تا کاتی چوونە قوتابخانەی هەست بکا کە شتێکی نامۆ نیە بەلایەوە و هەستیش بە ئاسوودەییەك بکات .

- جاری وایە مامۆستاکان هەندێك سامناکن بەلای منداڵەوە و ئەمەش هانی منداڵ نادەن بۆ چوونە قوتابخانە. بۆیە دەبێ تۆ باسی ئەزموونی چوونە قوتابخانەی خۆت بۆ منداڵەکەت باس بکەیت و هەروەها باسی ئەو مامۆستایانەشی بۆ بکەی کە وانەیان بە تۆ گوتۆتەوە. دەبێ منداڵەکەشت ئەوە بزانێ کە مامۆستاکەی لە قوتابخانەدا زۆری ئاگا لێی دەبێ. دەبێ هەوڵی ئەوەش بدەیت منداڵەکەت بە هەندێ لە مامۆستاکان هەروەك نموونە بە ڕۆژێك بەر لە دەست پێکردنی خوێندنێ بناسێنیت .

- منداڵ هەر لە تەمەنی ٣ سێ ساڵیەوە تا تەمەنی (٥) پێنج ساڵی زۆری حەز لە یارییە هەر بۆیە کاتێ دێیت و پێی دەڵێی دەبێ بچێتە قوتابخانە زۆر هەست بە تەنگە تاوی و نارەحەتیە دەکات، چونکە وادەزانێ ئیدی لەمەودوا کاتی یاری و زرمەزلێ نەماو بە سەر چوو . بۆیە دەبێ تێی بگەیەنی کە لە قوتابخانە دۆست و برادەری تازەی زۆرزۆرتر پەیدادەکا بۆ گاڵتە و گەمە و یاری. $\theta$

---

$^{\theta}$سەرچاوە / مجلە حلوە – helwa@yahoo.com / yahoo کراوە بەکوردی

$^{\theta}$ لە ڕۆژنامەی هەولێر ( ژمارە ١١٣٦ ) لە بەرواری ٢٠١١/٩/١٠ دا بڵاوکراوەتەوە .

# ڕەچاو کردنی جیاوازی ئاستی قوتابییان

ن/ شوارێ

ئاشکرایە قوتابییان هەموویان لەیەك ئاست وتوانادا نـین، بـەڵکو جیـاوازی بەرچـاو هەیە لەنێوانیاندا جا ئەو جیاوازییانە چ لە ڕووی ئاستی هۆشیاری بـن یـان لـە ڕووی ڕاددەیی. کەواتە ئامادەیـە بـۆ فێربـوون یـاخود بەشـێوەی بیرکردنـەوەی و کـارزانی ولێهاتوویی و دەست ڕەنگینی ئەوە جگە لە جیاوازی پێکهاتن لە لەشیان ( کـورت ، درێژ ، قەڵەوی ، لاوازی ، چالاکی وشتی تر ) ڕەنگە ئەو جیاوازییانە زگماك بن، یان کاردانەوەی ژینگەو شـێوەی پـەروەردەکردن و ئـەو ئەزموونانـەبێت، کـە لـە مـاڵ و قوتابخانە و دەوروبەری بەسەری داهاتووە، بۆ نموونـە ئـەو قوتابییـەی لـە خێزانێکـی دەوڵەمەند پێدەگات ئەزموونی زیاتر دەبێت لەو قوتابییەی لە بنەماڵەیـەکی هـەژارو

نەداردا گەورە دەبێ، جاوەنەبێ جیاوازی تەنها لە ئاستی قوتابی بۆ قوتابییەکی تر بەدی بکرێت بەڵکو لەئاستی خودی تاکە قوتابییەکیشدا دەبینرێت، بۆ نموونە: قوتابییەك لەوانەی (ماتماتیك) زۆر باشە، بەڵام لە (کیمیا ) بە باشی تێناگات زۆر ئارەزووی لە زمانی عەرەبی هەیە بەڵام توانای فێربوونی زمانەکانی تری نییە، زۆر جیاوازی تریش هەن کە بە ڕاستی کۆسپن لەبەردەم مامۆستا بۆ بەئاکام گەیاندنی پەیامەکەی.

بۆیە ڕەچاوکردنی جیاوازی ئاستی قوتابییان، بۆ تێروانینێکی پەروەردەیی زۆر ڕاست، بۆ ئەوەی لە پەنای ئەم ڕێگایەوە پەروەردەیەکی وا ڕەچاوبکرێت کە هەموو قوتابییان سوودی لێوەرگرن. ئالێرەوە جیاکردنەوەی قوتابییان مانای یارمەتی دانیانە بۆ ئەوەی هەر هەموویان لە خوێندن بێ بەش نەبن و بەبەردەوامی لە بواری زانستیدا بەرەوپێشەوە بچن. ناشکرێ ئەو ڕاستییەی فەرامۆش بکەین، کە ڕەچاوکردنی جیاوازی ئاستی قوتابییان، بەشتێکی دیموکراتی دەژمێردرێت و دەرگا بۆ هەموویان دەکاتەوە کە بەشداری لە خوێندن و زانست و زانیاریدا بکەن.

ئەگەر مامۆستا ئەو جیاوازییانە ڕەچاو نەکات، ئەوا پێچەوانەی ئەو بۆ چوونانەی سەرەوە ڕوودەدات، هەر بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە ئەگەر مامۆستایەك لەوانە گوتنەوەدا تەنها گرنگی بەقوتابییە لاوازەکان بدات ئەوا قوتابییەکانی تر بە تایبەتی بەتواناکان تووشی بێزاری دەبن وانەکە فەرامۆش دەکەن، چونکە لە ئاستی زانیاری ئەواندا نییە. خۆ ئەگەر تەنها گرنگی هەر بەزیرەکەکان بدرێ ئەوا قوتابییەکانی تر بەتایبەتی

لاوازەکان تووشی بێ ئومیدی دەبن، بڕوایان بە خۆیان نامێنێ و وانەکە لەسەر شانیان دەبێتە بارگرانی .

سەرەڕای ئەوەش مامۆستای زانا نەك هەر ڕەچاوی جیاوازی ئاستی قوتابییان دەکات، بەڵکو بەردەوام خۆی بە زیاتر پێگەیاندن و فێربوونی چەندین هونەری وانەگوتنەوە دەوڵەمەندتر دەکات، گۆڕانکاری نوێکاری لەوانەکەیان بەدی دەکرێت، بە پێچەوانەوە ئەو مامۆستایەی جیاوازی ئاستی قوتابییان لە بەر چاو ناگرێت خۆی بە زیاتر فێربوون و خۆپێگەیاندنەوە ماندوو ناکات، بەدەستی بەتاڵ دێتە ژووری وانەگوتنەوە و بیانووی هەمەجۆرەش لە بێ توانایی و لێ نەهاتوویی خۆی و لەبەر ئەوەی خۆی باش بۆ کاری فێرکردن ئامادەنەکردووە دەهێنێتەوە و نازانێت چۆن ڕەچاوی ئەو جیاوازییانە بکات. لێرەدا نابێ ئەو ڕاستییەش پشت گوێ بخرێت، کە زۆر جار فاکتەری تر دێتەپێش مامۆستا و دەبێتە هۆی ئەوەی بە ناچاری ئەو جیاوازییانە وەکو پێویست ڕەچاو نەکات وەکو ئەمانەی خوارەوە :

١- نەبوونی هەم ئاهەنگی لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەو کەس وکاری قوتابییانەوە .

٢- درێژی بەرنامەی خوێندن .

٣- نەبوونی هۆکاری فێرکردن لە قوتابخانەدا .

٤- زۆری ژمارەی قوتابییان لەناو پۆلدا، جا ئــەو کۆســپ و تەگەرانــە دەبنــە هــۆی ڕەچاونەکردنی جیاوازی ئاستی قوتابییان، بۆیە پێویستە چارەسەری ئەم چوار خاڵــەی سەرەوە بکرێ بۆ ئەوەی نەبێتە تەگەرە لەبەردەم مامۆستادا .[*]

---

[*] لە گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی ( ژمارە ٢٩ ) ئازاری ٢٠٠٣ بڵاوکراوەتەوە.

# هەوڵدان بۆئەوەی هەمووقوتابخانەکان بکەین بە نموونەیی‌نەکتەنها چەندقوتابخانەیەك

**ن/ شواریێ**

هەڵبەتە ئەمڕۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان هەوڵی زۆری داوە بۆ بەرەوپێشەوە بردنی پرۆسەی پەروەردەوفێرکردن لەهەرێمی کوردستان وچەندین کاروچالاکی فراوانیشی لەمبارەیەوە ئەنجام داوە، هەروەها هەموو هەوڵ وتوانای خۆی خستۆتەگەڕ بۆ ئەوەی لەهەموو گوندو شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا قوتابخانە بکاتەوە، تا ئەوانەی لە شاریش دوورن لە خوێندن بێبەش نەبن. من لێرەدا باسی قوتابخانەی نموونەیی دەکەم و ئەگەر تەنها چەند قوتابخانەیەك بن بەنموونەیی و لەدواییشدا هەوڵ بدرێ قوتابخانەکانی تریش بن بە قوتابخانەی نموونەیی، ئەم هەوڵدانە ماندووبوونێکی زۆری دەوێ وەك دەڵێن (چەپڵە بە دەستێك لێنادرێ). ئاشکرایە ئەمڕۆ کۆسپ و تەگەرەی زۆر هەن کەدەبنە هۆی دروست نەبوونی قوتابخانەیەکی نموونەیی، بەڵام ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە، هەوڵدانەکە بەرەو پێشەوەتر دەبات:

١- زیادکردنی بینایەی قوتابخانەکان، ئەمە یەکەم خاڵی هەرەگرینگە بۆ درووستبوونی قوتابخانەی نموونەیی، چونکە زیادکردنی بینایەی قوتابخانەکان دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ژمارەی قوتابییان لەناو پۆلدا، کە ژمارەی قوتابییانیش لەناو پۆلداکەمبۆوە، ئەوا ئەو کاتە مامۆستا دەتوانێ هەموو قوتابییان بەشێوەیەکی

ڕێکوپێك بەشدار بکات لە چالاکی ناو پۆلدا .

**٢-** زیادکردنی میلاکی قوتابخانەکان، بەتایبەتی زیادکردنی مامۆستایانی پسپۆر. ئەمەیان لەهەموو کارەکانی تر گرینگترە و پێویستی بەشارەزایی چاکیش هەیە لەم بوارەدا. فێربوونی قوتابی لەسەردەستی مامۆستای پسپۆر گەشەوئارەزووی پەروەردە و فێرکردن لەلای قوتابییان زیاد دەکات. جالێرەدا لەسەر بەڕێوەبەری قوتابخانە پێویستە وانەکان بەپێی پسپۆری مامۆستا دابەش بکات .

**٣-** دانانی پرۆگرامێکی ڕاست و دروست ویەکبوونی شێوە و شێوازی چاپ. زۆربوونی چاپەکانی پەڕتووك وەك چاپی هەرێم وچاپی بەغدا وچەندین هۆکاری تر لەپرۆگرامەکانی خوێندن، دەبنە هۆی دروستبوونی ئالۆزی لەناو پۆلدا.

**٤-** دانانی مامۆستای دەروونزانی لە هەمووقوتابخانەیەکدا. نابێ مامۆستای دەروونزانی بابەتی کۆمەلآیەتی وەك جوگرافیاو مێژووی بدرێتێ، بەلْکوپێویستە بابەتی دەروونزانی وەك هەموو وانەکانی تربخوێندرێ، ئەگەر لەهەفتەیەکدا یەك وانەش هەبێ، هەرباشە.

**٥-** زیادکردنی گوتنەوەی وانەی نموونەیی لەلایەن سەرپەرشتیارانی پەروەردەییەوە یاخود لەلایەن مامۆستایانی بەتواناوپسپۆر لەهەربابەتێکدا، بەتایبەتی ئەگەر قوتابییان لەگوتنەوەی وانە نموونەییەکاندا وەك گوێگر بەشداریی تێدا بکەن .

**٦-** بۆئەوەی قوتابی نموونەییمان دەست بکەوێ ، پێویستە مامۆستای پۆلێك نەگۆڕدرێ بۆپۆلێکی تر. زیادگۆڕینی مامۆستای پۆل ترسناکترین و کاریگەرترین مەترسییە لەسەر پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن، چونکە کاردانەوەی خراپی لەسەر قوتابییان و مامۆستایان هەیە. *

---

* لە گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی ( ژمارە **٣٩** )/ سالْی **٢٠٠٤**بلآوکراوەتەوە.

# ئەو ڕێگا هەمە جۆرانەی منداڵ سەرکەوتوو دەکات لە قوتابخانەدا...

زۆر گرینگە، دایك و باوکان بچنە ناو ژیانی قوتابخانەی منداڵەکانیانەوە و تێکەڵیان بن، تا سەرکەوتن بۆ کوڕ و کچەکانیان دەستەبەر بکەن و لە خوێندنی ئاکادیمیانەیاندا سەرکەوتوو و باڵا دەست بن. دیارە هەموو دایك و باوکێکیش لە پێناو ئەو سەرکەوتن و باڵا دەستیەیاندا بە دوای ئەوەوەن، ئەو زانست و زانیارییە ئەکادیمیە پێویستانە بگەیەننە منداڵەکانیان تا لە قوتابخانەدا سەرکەون و دوا ڕۆژێکی ڕوون و بەرچاوو ژیانێکی سەرکەوتووانەی شایانیان بۆ بەدی بێنن. بە جەختێکیشەوە دەڵێین تۆ وەك دایکێك هەموو کاتێ ناتوانی هەروا بە ئاسانی هاریکاری و کۆمەکی منداڵەکەت بکەیت تا لە قوتابخانەدا سەرکەوتوو بێت، لەبەر ئەوە هەندێك بیرو بۆ چوونی هەمەجۆر و کارا هەیە یارمەتیت دەدات، بتوانی ئەو ڕێگاو بیرۆکە جیاوازانە بدۆزێتەوە تا یارمەتی منداڵەکەتی پێ بدەی تا باڵا دەست و سەرکەوتوو و جیاوازتر

بێت لە قوتابخانەدا ، کە ئــەوەش پێویســتی بــە هاریکاریتــە لەگــەڵ مامۆســتایانی قوتابخانەدا، کە ئەمانەن :

١- هەمیشە لەگەڵ منداڵەکەتدا باسی پەیوەندی ئەو شتانە بکە لە قوتابخانــەدا کــە هەموو ڕۆژێ فێری دەبێ و چۆنا و چۆنیش ئەو زانیارییانەی فیریان بووە لــە ئاینــدەدا بەکاریان دەهێنــێ، هــەروەها دەبــێ ســەرەتای دەســت پێکردنــی قســەکانت لەگــەڵ منداڵەکەتدا دەربارەی ئەو ئامانجانەی دوا ڕۆژی بێت کە فێریان دەبــێ، چــونکە بــەم شێوەیە دەتوانی یارمەتی منداڵەکەت بدەیت لە بیرکردنەوەی ئایندە و دواڕۆژی خۆی، بۆ وەدیهێنانی ئامانج و ئاواتەکانی. دەبێ لە قساندا لەگەڵ منداڵەکەت، زۆر ئاگــات لە هەڵبژاردنی ئەو زانکۆ و قوتابخانانە بێت کــە بــۆ خوێنــدن هــەن. هــەروەها نابــێ ئەوەشت لە بیر بچێ کە باس و خواس و سەر بوردەی ئەو گەورە پیاوانەشی بۆ بکەی، کە کار دەکەن و بەکارەکانیانەوە دەنازن و چێژیان لێ وەردەگرن. دەبێ جــەختیش لــە منداڵەکەت بکەیتەوە کە دەرفەت و هــەلێکی زۆری هەمــەجۆری لەبــەر دەســتە کــە دەتوانێ دەستنیشانیان بکات و تێیاندا سەربکەوێت و دابینیان بکات .

٢- هیچ ئــەزموونێکی نــەرێنی بــۆ منداڵەکــەت بــاس نەکــەی کــە بەمنــداڵی لــە قوتابخانەدا بۆ خۆت پێیدا تێپەڕیویت، چونکە بەو کارە، بەبێ ئەوەی تۆ هەستی پــێ بکەیت کارێکی نەرێنی زۆر کاریگەر دەکاتە سەر منداڵەکەت و بۆ ســەرەتای چــوونە خوێندن و قوتابخانەی باش نیە و نابێت. ئەوەش بزانە کە تۆ بیرۆکەی ئــەوەت خســتە مێشکی منداڵەکەتەوە کە قوتابخانــە هەمیشــە قــورس و گرانــە و مامۆســتاکانیش دادپەروەرنین و خوێندنیش هێندە گرینگ نیــە، بــەوە منداڵەکــەت هانــدەدەی هــەوڵ نەدات و لە قوتابخانەدا باش نەخوێنێ و خۆی ماندوو نەکات. بەڵکە واباشترە بۆ خۆت و بۆ منداڵەکەت کە باسی هاوڕێ و هەڤاڵ و مامۆستا خۆشەویستەکانتی بۆ بکــەیت

و ئەو وانانەی حەزت لێیان بوو و پێت خۆش بوو بیانخوێنی، هەرگیز نەکەی ئـەوە بـە منداڵەکەت بڵێی کە قوتابخانە بەلای تۆوە ئەزموونێکی خـراپ و تفـت و تـاڵ بـووە، نەکەی بهێڵی قوتابخانەی بدزێ و ڕکی لێی ببێتەوەو لە بەر چاوی ناشیرین بێ .

٣- یارمەتی منداڵەکەت بدە لە دەستنیشان کردنـی کۆمەڵـە ئامـانجێکی خوێنـدن وفێربوونێ بۆ ماوەیەکی نزیك و دوور، هەروەها دەتوانی بۆنموونە باسی پلانی ئاینـدە و دوا ڕۆژی چوونە زانکۆی لەگەڵدا بکەی. بۆ ئامانجە نزیکەکانیشی دەتوانی بۆ نموونە باسی ئەو بابەتە لەگەڵ منداڵەکەتدا بکەیت، کە دەبـێ تـا پـێش ڕۆژی یـەك شـەممە بینووسێت و لێی ببێتەوە.

٤- دەبێ لەگەڵ منداڵەکەتدا باسی ئـەو وانـەی خوێندنانـە بکـەیت، کـە هـەر لـە منداڵیەوە دەیانخوێنێت تـا دەگاتـە قۆناغـە جیاوازەکـانی دیکـەی خوێنـدن. دەبـێ هەمیشە ئەو جۆرە پرسیارە کراوانەی لێ بکەیت کە وەڵامەکانیان ( بەڵێ و نا ) نـین. و هەروەها دەشتوانی ئەو وانانە تاو تـوێ بکـەیت و بیانخوێنیتـەوە کـە منداڵەکـەت دەیانخوێنێ .

٥- جێیەکی بۆ منداڵەکەت تەرخان کە لە ماڵێدا تێیدا بخوێنێ و کۆشـش بکـات و ئەرکەکانی قوتابخانەی تێدا ئەنجام بدات. بۆ نموونە دەتوانی کتێبخانۆکەکی بچکۆلە و کورسییەکی لەلایەکی ژووری نووستنێ دوور لە تەلەفزیۆن بۆ دابین بکەیت. دەبێ ئەو پانتاییەش هەموو ئەو پێداویستیانەی لێ بێ کە منداڵەکـە پێویسـتی پێیانـە، وەك قەڵەم و ڕاستە و دادەر و خەت کوژێنـەوە و کتێـب و سـیپارە. لەگـەڵ منداڵەکەتـدا ماوەیەك دیاری بکەن تێیدا هەموو ئەرکەکانی قوتابخانەی لەو ماوەیەدا تەواو بکات، بۆ ئەوەی منداڵەکەت هەموو ڕۆژێ پابەند بێ بەو سۆزو بەڵێنەوە. ئەگـەر توانیشـت بۆت هەیە لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیشیدا هاریکاری بکەیت .

٦- هەمیشە لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکانی کەسوکاری قوتابییان ئامادەبـە، کـە قوتابخانە ڕێکی دەخا و ئەو پرسیار و تێبینیانەش ئامادەبکە کە دەبنە هۆی یارمەتی بۆ سەرکەوتنی زیاتر و زیاتری منداڵەکەت لە قوتابخانەدا. خۆ ئەگەر منداڵەکەت لـە قوتابخانەدا دڵخۆش و بەختەوەربوو، یان گیروگرفتی خوێندنی هەبوو لەناو پۆلدا، دەبێ هەر زووبەزوو مامۆستایانی لێ ئاگـادار بکەیتـەوە. هـەروەها دەبـێ ئـەو سـەرنج و تێبینیانەش هەموو بنووسییەوە کە لە کۆبوونەوەکـەدا دەردەکـەون، تـا لـە ماڵـەوە لەگەڵ منداڵەکەت باسی بکەیتەوە .

٧- هەوڵدە خێزان تێکڕا بە کۆمەڵ هاوبەشـی ئـەو چـالاکییە هەرەوەزییانـەبن کـە دەکرێن، وەك کۆکردنەوەی خۆراك بۆ هەژار و لێقەوماوان و یارمـەتیدانی بەساڵداچوان و پیروکەنەفتان، کە دەبێتە هۆی گرینگی دانی منداڵ بە یارمـەتیـدان و هاریکـاری و بە هاناوە چوونی کەسانی تر، کە ئەم خەسڵەتانەش بەهایەکن لە قوتابخانەدا پێویستی پێیان دەبێ و لە ژیانیشیدا کە گەورە دەبێ و دەبێتە فەرمانبەرێك لە ئاینـدەدا هـەر ئاتاجیان دەبێتەوە .

هەندێك توێژینەوە باس لەوە دەکەن کە ئەو منداڵانەی گفتوگـۆ و دەمەتـەقێ لەگـەڵ مامۆستاکانیاندا دەکەن، نمرەی زیاترو باشـتر وەردەگـرن و هەمیشـە لـە قوتابخانـەدا سەرکەوتوو و باڵا دەستترن. لەبەر هێندێ دەبێ هەر نەبێ ژەمێکی نانخواردنێ هەبێ، کە هەموو تاکەکانی خێزانی تێدا ئامـادە بـن تـا دەرفـەتی قسـەوباس و گفتوگـۆ و وتووێژی تێدا بڕەخسێ. *

---

* سەرچاوە :– لەرێی : / مجلە حلوە – helwa@yahoo.com / yahoo کراوە بە کوردی لە ڕۆژنامەی خەبات لاپەڕەی پەروەردەو فێرکردن ( ژمارە ٣٩٤٦) لە بەرواری ٢٠١١/١٢/١٨ دا بڵاو کراوەتەوە .

# مامۆستا کێیە؟

ئەو پرسیارە بە مێشکی زۆر کەسدا دێت کە داخوا مامۆستا کێیە ؟؟
مامۆستا ئەو فەرماندە پەروەردەییەیە، کە پێشەنگی پرۆسەی گەیاندنی شارەزایی و زانیارییە پەروەردەییەکانە، رێنوێنی رەفتار وهەڵس و کەوتی ئەو فێرخوازانەویە کە وانەیان پێدەڵێتەوە. بەڵێ ئەو (مامۆستا) فەرماندەیەکی پەروەردەیی گۆڕەپانەکەیە، شەڕو بەرەنگاربوونەوەکانی هەمووی راستەوخۆ دژی نەزانین و دواکەوتوویییە، زۆر ئازایانەو سەرکەوتووانەش بە چەکی بیر و باوەرێکی پتەو بە پەروەردگار و لەبەر رووناهیا ئەو زانستانەش کە هەیەتی و پێی پڕچەکە، بەردەوام رۆژانە هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارێ سەرکەوتن بە دوای سەرکەوتندا وە دەست دەهێنێ، کە بەم هەوڵ و هیممەتەشی دڵی هەموو ئەو خەڵکانەی دەوروبەری خۆش و شاد و ئاسوودە دەکات. هەر بۆیە ئەو خەڵکانەش مامۆستایان بە مۆم چواندووە و وای ناو دەبەن کە

مامۆستا مۆمە، خۆی دەسووتێنێ تا ڕێگای بەردەمی کەسانی دی ڕووناك بکاتەوە، هیچ گومانێکیش لەوەدا نیە کە ئەو ناونانەی مامۆستا ماناو مەبەستێکی زۆر گەورەی بۆ پێگەی مامۆستا لە پشتەوەیە، هەرچەندە دڵی من بەو ناو لێنانە و بەو مۆم چواندنەی ئاو ناخواتەوە، چونکە مۆم کە سووتا و توایەوە هەر تەنیا خۆڵەمێشی ڕووت لە دوای خۆیەوە جی دەهێڵێ، کە دەبێتە هیچ و هیچیش هیچی لە دەست نایە، بەڵام من مامۆستا بە خۆری پرشنگدار دەچوێنم، چونکە تیشك و ڕووناکییەکەی بۆ خۆشیەتی و بۆ خەڵکیش. هیچ کەسێك ناتوانێ چاو پۆشی لە ڕۆڵی گەورەی مامۆستادا بکات لە بنیاتنانی مرۆڤ و گەشە و دروستکردنی شارستانییەتەکاندا و خۆی لێ گێل بکا . بەڵکە سەرکەوتنی سیستەمی فێرکردن یانی سەرکەوتنی شارستانی و خەسڵەتەکانی ... ئەدی ئەوە نیە وەك وتەبێژێکی ئەڵمانی دەڵێ : ئەوە سەرکەوتنی مامۆستای قوتابخانەی ئەڵمانییە کە ئەڵمانیای لەشەڕی حەفتایەکاندا سەرخست ، و وتەبێژێکی فەرەنسایش دەڵێ : فەرەنسا لە شەڕی دووەمی جیهانیدا نە دەشکا ، ئەگەر پەروەردەکەی دوانەکەوتبایە ، و فەرماندەیەکی ئەمەریکیش دوای ئەوەی کە ڕووسەکان بۆشایی ئاسمانیان گرت دەڵێ : ئەرێ ئەوە سیستەمی فێرکردنمان چی لێقەوماوە و چی بەسەرهاتووە ؟ کەواتە هەر مامۆستایە سەرکەوتن دروست دەکات و هەر ئەویشە دەبێتە هۆی شکان و بەزینێ . یەکێك لە توێژەرەوەکان دەڵێ : مامۆستایە شوێن و شوێنەواری ڕوون و ئاشکرا نەك هەر بەسەرتاکەوە بەڵکە بەسەر کۆمەڵگاوە بەجێدەهێڵێ . هەروەك چۆن پزیشکەکان کە نەخۆشێك چارەسەردەکەن ئەو جێیە نەخۆشەی ناو لەشی چارەسەر دەکەن و بەس ، نایەن هەموو لەشی چارەسەر بکەن ، بەڵام مامۆستا کە لە پۆلدا وانە بە قوتابییەکانی دەڵێتەوە ، هەر تەنیا نایە وانەکە بە تاکە یەك قوتابی بڵێتەوە ، بەڵکە

هەر لەیەك کاتدا وانە بە دەیان قوتابی ناو پۆلەکەی و لە ڕۆژێکدا بەسەدان قوتابی تێکڕای قوتابخانەکە دەڵێتەوە هەر بۆیەیە ئەو کاریگەرییەی کە مامۆستایەکە دەیکاتە سەر هزرو بیرو هۆش و مێشکی قوتابییەکان وسەر کەسایەتی و چۆنیەتی گەشەکردن و کرانەوەیان بەسەر راستیەکانی ژیان و زۆرجارانیش بەسەر ڕێڕەو و ڕێچکەی ژیانیاندا بە درێژایی تەمەنیان پزیشکەکە ئەو کاریگەرییە ناکاتە سەر تەواوی لەشی نەخۆشەکانی . جا هەر لەبەر هەموو ئەو شتانەی سەرەوە زانایانی پەروەردە و گرنگیدەرانی بواری فێرکردن هاتوونەتە سەر توێژینەوەی ئەو کارو بارانەی راستەو خۆ پەیوەندن بە مامۆستاوە ، هەندێ توێژەرەوە هەن هەر راست لەلایەنە دەروونییەکانی مامۆستاو خەسڵەتە زانستیەکانی دەکۆڵنەوە ، هەندێکیش هەن لەلایەنی چۆنیەتی هەڵس و کەوتی مامۆستا لەگەڵ قوتابییاندا دەکۆڵێتەوە و هەشیانە لە شێوازی وانە گوتنەوەی راست و دروستی مامۆستا دەکۆڵێتەوە .

ئەوەتا (ئیرل بولیاس، و جیمس یونگ) لە کتێبەکەیاندا دەربارەی مامۆستا کە بەناوی (Ateacher is may things) ە، پتر لە بیست خەسڵەتی مامۆستایان باس کردووە، کە گرنگەکانیان ئەمانەن :

١- مامۆستا لەگەشتی زانستەکاندا ڕابەرە، بە ئەزموون و شارەزاییەکانی خۆی پشت ئەستوورە، چونکە شارەزای ڕێبازەکەیە و گەشتیارەکانیش باش دەناسێت و بایەخێکی زۆریش بە فێرکردنێیان دەدات.

٢- مامۆستا نوێخواز وتازەکەرەوەیە و پردێکە لە نێوان نەوەکاندا.

٣- مامۆستا نموونە و پێشڕەوە، لە هەڵوێستەکاندا، لە قسەو گفتوگۆ و لە خووخدە و جل و بەرگ و پۆشاکەکاندا.

٤- مامۆستا باسکار (باحث ) ە و هەمیشە بە دوای زانین و فێربوونی زیاترەوەیە .

٥- مامۆستا ئامۆژگاریێکی دەست و دڵپاك و هاوڕێیەکی دڵسۆز و داهێنەر و هاندەرێکی گەورەی داهێنانە.

٦- مامۆستا شارەزایەك و مرۆڤێکی لێزانە، و ئەوەش باش دەزانێ کە دەبێ زۆر بزانێ.

٧- مامۆستا پیاوێکی گەڕۆکە ، زەبردەستە ، ئەکتەرە ، لە ڕووە ، بنیاتنەری کۆمەڵگایە .

٨- مامۆستا ڕووبەڕووی راستیەکان دەبێتەوە، داواکاری زانست و فێربوونە، راستکەرەوەیە، دڵسۆزە، مامۆستا مرۆڤە. جا لەبەر هەموو ئەمانە دەتوانین بڵێین مامۆستا، دەبێ لەجێی چاوساغێکی بەتوانا و ڕابەرێکی هێمن و لەسەر خۆی ئاراستەکردنی منداڵان بێ، بەرەو بەرهەم و خوو و ڕەوشت و ڕەفتار و هەلس و کەوتی ڕاست و ڕەوای چاك، ئەو براگەورەیەش بێت کە کەش و هەوایەکی گونجاوی ئەوتۆ بۆ منداڵان بڕەخسێنێ کە حەزی پێدەکەن، و دەبێ لەگەڵیاندا بژیەت و بە هەوای ئەوانیش بجووڵێتەوە و خۆی لەوان بە زیاتر نەگرێ و خۆیان لەسەر بانەدا و، ئەرکی ئەوە کە یارمەتییان بدات و پشتیوانیان بێت و بە دەنگیانەوە بچێت و لە زاڵبوون بەسەر ناخۆشی و تەنگوچەڵەمەکانیاندا هاریکاریان بێت، تەنیا هەر بەو شتانەش دەتوانێ خۆشەویستی و متمانەی قوتابییەکانی وەدەست بێنێ و کار لە دڵ و دەرونیشیان بکات و بەرەو خێرو خۆشی خۆیان و خێرو چاکەی مرۆڤایەتییان بەرێت. ئەوەتا چەندین مامۆستای خۆشەویست و لەبەردڵان ئازیز توانیویەتی وشك و برینگترین شتی ناخۆش، تەڕو تۆڵ و ئاسان بکاتەوە لای قوتابییەکانی . ❋

# خەسڵەتەکاتی مامۆستای سەرکەوتوو

## یەکەم: لە بواری کەسایەتیدا:

١- خۆڕاگربێت و هەڵنەچێ .

٢- شێوە و ڕواڵەتی پۆشتە و جوان بێ.

٣- متمانەی بە خۆی بێت و ڕێزی ئەو متمانەیەشی لابێت.

٤- توانای ڕوو بە ڕووبوونەوەی هەڵوێستەگران و نالەبارەکانی لە دەرەوەو ناوەوەی پۆلداهەبێ .

٥- گەشە و پێگەیاندنی گیانی خۆڕاگری خودی لە قوتابییاندا بە هەند وەربگرێ.

٦- ڕێزی هەست و توانا و ئازادیی قوتابییان و کەسانی تری لە لابێ .

٧- دەبێ لە کەسایەتی و ڕەفتارەکانیدا پێشڕەو بێت .

٨- دەبێ کەسایەتییەکی سەرنج ڕاکێش و گەش و ڕووخۆشی هەبێت.

**دووەم: لە بواری وانەوتنەوەدا :-**

١- دەبێ توانای بەسەر مادە زانستییەکاندا بشکێ.

٢- دەبێ توانای گەیاندنی زانیارییەکانی هەبێت و بیروڕایەکانیشی بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەرببڕێت .

٣- ڕێ و شوێنە نوێیەکان لە وانە وتنەوەدا بەکاربێنێ .

٤- ژینگەی خۆجێی بە وانەکانەوە ببەستێتەوە.

٥- جیاوازییە تاکە کەسیەکان لەبەرچاوبگرێت .

٦- سەرنجی قوتابییان ڕاکێشێ وبیان وروژێنێ.

٧- توانای هەڵبژاردن و دەستنیشان کردنی ئەو چالاکی و هۆی فێربوونانەی کە ئامانجی پرۆگرامەکانە هەبێت و لەبەرچاوبگرێت.

**سێیەم: بواری هەڵسەنگاندن و پێشخستن**

١- بەکار هێنانی هۆیە جۆراوجۆرەکان لە هەڵسەنگاندنی بابەتییانەدا.

٢- توانای داڕشتنی پرسیاری تاقیکردنەوەکان.

٣- دەستنیشان کردنی ئاستی فێربوونی قوتابییان.

٤- توانای رەخنەگرتنی بنیاتنەرانە.

٥- توانای نووسینی تێبینی لە دەفتەری قوتابییاندا.

## چوارەم: بواری پەیوەندییە مرۆییەکان:

١- هاوکاری کردنی ئاوەڵانی کار و بەڕێوەبەریەتی قوتابخانەو بەشە زانستییەکان ، لە دانانی پلان و وانە وتنەوەدا.
٢- هاوبەشیکردنێکی چالاکانە لە کۆبوونەوەی مامۆستایان و بەڕێوەبەریەتی قوتابخانەدا.
٣- توانای لێك حاڵیبوون لەگەڵ کەسوکاری قوتابییاندا بەشێوەیەکی زۆر گورج و گۆڵ و چالاکانە.
٤- توانای گەیاندنی هەست و نەستی کەسانی تر و ڕێزگرتنی بیر و ڕایان.
٥- باش گوێگرتن لە وتەی کەسانی دی.
٦- هاو بەشیکردنێکی ئەرێنیانە لە چالاکییەکانی قوتابخانەدا.
٧- توانای لێکتر حاڵیبوونێکی باش و ڕەخنەی بنیاتنەرانە لە گەڵ کەسانی ناو قوتابخانەدا.

## پێنجەم: بواری ژینگەی پەروەردەیی:

١- مەشق و جێبەجێ کردنی تیۆری و زانستی لە وانە وتنەوەدا.
٢- توانای دەربڕینی حەز و ئارەزووە ڕاستە قینەکان بۆ پیشەی مامۆستایەتی و وانە وتنەوە.
٣- چوون بەرەو ئاراستەی داهێنان و تازەکردنەوە لە پیشەی مامۆستایەتی و فێرکردندا.
٤- پێگەیاندنی هەستی پابەندی (ئینتیما) ڕاستەقینە لە کۆمەلگادا.

## شەشەم: هەڵسەنگاندن لە ڕێگای شیتەڵکردنی ئاوێتە بـوونی نێـوان مامۆسـتا و قوتابی:

ئاوێتە بـوونی نـاوپۆلی نێـوان مامۆسـتا و قوتابییـەکانی لەهـەنگاوی هەڵویسـتە فێرکاریەکاندا، کە جێیەکی دیاری هەیە لە ژینگەی پۆلەکەدا، بە یەکێك لە شـێوازە نوێیەکان دادەنـرێ بـۆ هەڵسـەنگاندنی کـاری مامۆسـتا، ئـەو شـێوازەش لـە ڕێـی شیتەڵکردنی تێبینیە ڕاستەوخۆیەکانی ئاوێتـە بـوونی سـەر زارەکـی نێـوان قسـەی مامۆستا و ڕەفتارەکەی، ئەو و قوتابییان و رەفتارەکانیانەوە دەبێت . •

---

• سەرچاوە : سایتی googel کراوە بە کوردی

*لە رۆژنامەی خەبات ژمارە(٤١٥٩) لەبەرواری ٢٠١٢/٩/١٩بڵاوکراوەتەوە

# بەرپرسایەتییەکانی مامۆستا

مامۆستاخاوەن پێشەیەکی پیرۆزە ، جێی دڵنیایی وپەروەردە کردنێکی زۆرچاك و لەباری قوتابییە لە هێنانەدی سیاسەتی فێرکردنی وڵات و هێنانەدی ئامانجەکانیدا .

هەر بۆیە بەرپرسایەتی مامۆستا و ئەرکەکانی ئەم لایەنانە دەگرێتەوە :

١- پابەند بوون بەپەیڕەو و پرۆگـرام و ڕێنـوێنی و رێسـایەکانی رەفتـار و چـۆنیەتی هەڵس و کەوتەکان، ودوور کەوتنـەوە لـە هـەموو ئـەو کارانـەی پیشـەکە لەکـەدار دەکەن .

٢- ڕێزگرتنی قوتابی و ڕەفتار لەگەڵ کردنی بەشێوەیەکی پەروەردەییانەی ئەوتۆ، کە ئاسوودە و ئەرخەیان و دڵنیای بکاتەوە، گەشـەبە کەسـایەتییەکەی وپەرەبـە بـەهرەو داهێنانەکانی بـدات، نـرخ و بـەهای خـۆی لـەلا بەرجەسـتە بکـات، خۆشەویسـتی

فێربوونێی له دڵدا بڕوێنێ و ڕەفتاری جوان و خۆشەویستی کەسانی دیکەی فێرکات و هەوڵی بەردەوامی لەسەر ڕاستگۆیی و باوەڕ بەخۆبوونێی بدات.

٣- هەموو ئەو وانانە بلێتەوە کە ئەرکی خۆیەتی و بۆی دیاریکراوە، هەموو هەوڵێکیشی بخاتەکار بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی ئەو وانانە کە بریتین لە ئامادەکردنی وانەکان و ڕێ و شوێنی چۆنیەتی وتنەوەیان و شێوەی هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوە و ڕاستکردنەوەو هەموو چالاکییەکانی دی لە دەرەوە و ناوەوەی پۆلدا، و ئەمانەش هەمووی بە گوێرەی شێوازی کارەکە و سروشتی بابەتەکە و لەسەر ڕێنمایی پەیڕەو و پڕۆگرام و ئەو ڕێنماییانەش دەبێ کە لەلایەنە پسپۆڕیەکانەوە دێن .

٤- سەرپەرشتی کردنی ڕۆژانەی قوتابییان و پڕکردنەوەی وانەی پۆلە چۆڵەکان و وتنەوەی وانەی مامۆستا نەهاتووەکان و پڕکردنەوەی کەموکەسری ژمارەی مامۆستاکان بە گوێرەی ئاراستەکانی بەڕێوەبەریەتی قوتابخانە.

٥- پێشڕەوی کردنی ئەوپۆلەی بەڕێوەبەرپێی دەسپێرێ، و ڕۆڵی خۆی لە ڕابەرایەتی پەروەردەی تەواوی قوتابییانی پۆلەکەدا ببینێ، وچاودێری ڕەفتار و باری کۆمەلایەتییان بێت، باس لەلایەنە لاواز و کەمتەرخەمیەکان و چارەسەریەکانیان بکات، ئەمەش هەمووی بە یارمەتی و هاریکاری مامۆستا و کەس وکارەکانیان و بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەو ڕابەری قوتابییانیش دەبێت ئەگەر پێویست بوو .

٦- خوێندنەوەی پرۆگرامەکان، پلانــەکانی خوێنــدنێ، کتێبــە بڕیــارلێ دراوەکــان و هەڵسەنگاندنیان، و پێشنیاری گونجاو بــۆ گەشــەپێدان و گونجانــدنیان لەگــەڵ ژیــانی سەردەمەکەدا .

٧-جێبەجێ کردنی هەموو ئــەو بەرنامــە چــالاکیانەی بەڕێوەبــەر پێــی دەســپێرێ و پابەندبوون  بەو کات و ساتانەش کە بۆ ئەو چالاکیانە دیاری دەکرێ .

٨- پابەندبوون بەکات و ساتی هاتنە قوتابخانەو کاتەکانی چوونەوەوە و ڕەنێوهێنانی ئەو دەمانەی ناو ژووری پۆل بۆ بەرژەوەنــدی قوتابییــان، مانــەوە لــەناو قوتابخانــەدا لــەکاتی وانەنــەبوون (شــاغر) دا ، و بەســەربردنی ئــەو کاتانــە بــە تەماشــاکردنی ئەرکــەکانی قوتابییــان و ڕاســتکردنەوەو چــاك  کردنیــان، هــەروەها ئامــادەکردنی هۆیــەکانی فێرکــردن و ســوود بیــنین لەسەرچــاوە فێرکارییــەکانی نــاو قوتابخانــە و ئامادەبوون بۆ چالاکییەکانی دیکە .

٩- ئامادەبوونی ئەو کۆڕوکۆبوونەوانــەی بەڕێوەبــەری قوتابخانــە لــە دوای دەوامــی فەرمی ڕێکیان دەخا، وبەجێهێنانی هەموو ئەو ئەرکانــەی لــەو کــۆڕو کۆبوونەوانــەی دەیدرێتێ، کە ئەمانەش ئەرکی هەر هەموو مامۆستایەکن .

١٠- هاریکاری لەگەڵ بەرێوەبەریەتی قوتابخانــەو تێکــرای مامۆســتایان و هــەموو ئەوانــەش کەلــە قوتابخانــەدا کاردەکــەن و هەڵدەســوورێن بــۆ ڕێــك و پێــك کــردن و پێشخستنی خۆێندنێ وهێنانەدی ژینگەیەکی شایان و شایستە بە قوتابخانە.

١١- هەوڵدان بۆ خۆپێگەیاندنێکی زانستی و پیشەیی، پەرەدان بە ڕێ وشوێنی وانە وتنەوەکانی ، بەکارهێنانی ئامرازو ئامێرو تەکنەلۆژیای نوێ، و بەشداری کردن لە کۆبوونەوە و لیژنەکان و بەرنامەی چالاکیەکان و خولە پەروەردەییەکان، خۆنوێکردنەوە و ئەو وەرشانەی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی پسپۆرو بەرێوەبەریەتەکانی پەروەردە دەیانکەنەوە و بەگوێرەی کات و شوێنی دیاریکراو ڕێکیان دەخەن.

١٢- هاریکاری لەگەڵ سەرپەرشتیارە پەروەردەیییەکان و هەڵس و کەوتێکی ئەرێیانە لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە رادەسپێردرێن بۆ پێشکەشکردنی ئەزموون و شارەزاییەکانی خۆیان . *

---

*سەرچاوە : سایتی googel کراوە بە کوردی

لە ژمارە (٤١٦٥)پێنج شەمە ٢٠١٢/٩/٢٧لە رۆژنامەی خەبات دا بڵاو کراوەتەوە .

# خۆشەویستی مامۆستا بۆ بابەتەکەی دەبێتە هۆی دروستبوونی خۆشەویستی لە نێوان مامۆستا و قوتابی

**ن / شواریٚ**

خۆشەویستی و حەزو ئارەزووی مامۆستا بۆ بابەتەکەی خۆی، وا لە مامۆستا دەکات بەدوای زانست و زانیاریدا بگەڕێ و زیاتر خۆی بە زانست و زانیاری دەوڵەمەند بکات لەمەڕ ئەو بابەتەی دەیڵێتەوە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆیەك وا لە مامۆستا بکات کە بەهەر شێوەیەك بێ ئەم زانست و زانیارییانەی کە لایەتی بیگەیەنێتە قوتابییان. کاتێ کە قوتابی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لە بابەتەکە نەگات، ئەوا مامۆستا بە چەندان ڕێگا و شێواز هەوڵ دەدات قوتابییەکە بە شێوەیەکی خێرا تێبگات. ئەوکات پەیوەندی خۆشەویستی نێوان قوتابی و مامۆستا دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر هاتو

مامۆستای وانه ئارەزووی بۆ بابەتەکەی نەبێ، ئـەوا دەچـێتە پـۆل و کـورد گوتـەنی (هەر وانەگوتنەوەکە بەڕێ دەکات) ، قوتابی لێرەدا دووچاری شلەژانی دەروونی دەبێ و سزادانی قوتابییان و هەست بریندار کردنیان، ئەمەش هەمووی لـە ئـەنجامی ئـەوە دروست دەبێ کە مامۆستاکە بابەتەکەی خۆش ناوێ! جـا بۆیـە دژایـەتی لـە نێـوان مامۆستا و قوتابی دروست دەبـێ، چـونکە منـداڵ یـاخود قوتـابی زۆری حـەز لـە لاساییکردنەوە هەیە، بۆیە کاری مامۆستاکەی یاخود لە ماڵـەوە کـاری دایـك یـان باوکی دووبارە دەکاتەوە. ئەگەر هاتو کاری چاك بوو، ئەوا قوتابییەکی چاك دروست دەبێ، بەڵام کاری خراپ یاخود توندوتیژی مامۆستاکە دەگوازێتەوە بـۆ قوتابییەکـە. بۆیە پێویستە مامۆستا بابەتەکەی خۆی خـۆش بـوێ، ئەمـەش لـە قوتابخانەکانـەوە کارێکی زۆر قورس دەبێ، پێویستە هەوڵ بدەین لە پەیمانگاو کۆلێژەکانەوە دەست پێ بکەین. لێرەدا دەبێ قوتابی بـە حـەزو ئـارەزووی خـۆی لـە بەشـێك وەربگـیرێ، تـا دووچاری دژایەتی نەبێ لەو بەشەی کە بۆی هەڵدەبژێرێت، ڕەنگە دووربێ لە ئارەزووی خۆی، بۆیە پێویستە هەوڵ بدەین تۆوی حەزو ئارەزووی زیاتر بکەین. ڕاستە لەوانەیـە بڵێین ئەگەر بە حەزو ئارەزوو بێ، ئەوا هەمووان کۆلێژی پزیشکی یـاخود ئەنـدازیاری یاخود یاسا وڕامیاری هەڵدەبژێرن ! من دەڵێم خاڵی هەرە گرنگ بـۆ چارەسـەرکردنی ئەمەش، یەکسانکردنی مووچەکانە لەنێوان فەرمانبەران و مامۆسـتایان و پزیشـك و ئەندازیارو.... هتد ، ئەمە وا دەکات کە تەنها بیر لە حـەزو ئـارەزووی بابەتەکـەی بکاتەوە و هەڵیبژێرێ . بە بۆچوونی من ئەمە دەبێتـە هـۆی بـەرەو پێشـەوە بردنـی ڕەوشی پەروەردە. *

---

* لە گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی( ژمارە٤٩) تشرینی دووەم ساڵی ٢٠٠٤ بڵاوکراوەتەوە .

# له دیارده نه‌شیاوه‌كانی نێو هه‌ندێك قوتابخانه

**ن/ شوارێ**

پیشه‌ی مامۆستایه‌تی، پیشه‌یه‌كی پیرۆزه وه‌كو ئاوی كانی پاك و بێگه‌رده. مامۆستا ڕابه‌ری شۆڕشی پێشكه‌وتنه، مامۆستا به‌ هه‌موو مانای وشه ده‌بێت مامۆستا بێت. مامۆستا به‌ر له‌ هه‌موو شتێك كرداری په‌روه‌رده‌كردنی نه‌وه‌ی دواڕۆژی له‌ ئه‌ستۆیه، واتا بڵێین به‌ر له‌وه‌ی په‌روه‌رده‌كردنی منداڵ له‌ ئه‌ستۆ بگرێت، ده‌بێت خۆی باش په‌روه‌رده‌ بكات، چ له‌ ڕووی ڕه‌وشت، چ له‌ ڕووی ڕۆشنبیری و ئاستی زانستی و ئه‌ده‌بی و كۆمه‌ڵایه‌تییه‌وه، ده‌بێت لێهاتوو و دڵفراوان و لێبورده‌بێت.
به‌ڵام جێی داخه ئه‌وه‌ی ئه‌مڕۆ ده‌بینرێت و هه‌ستی پێده‌كرێت، زۆریش زه‌ق بۆته‌وه، چه‌ند هه‌ڵسوكه‌وت و ڕه‌فتارێكی ناشایسته‌و چه‌ند دیارده‌یه‌كی قێزه‌ونه، كه‌ له‌ بری

ئەوەی کاك یان خوشکی مامۆستا بەخۆ ڕۆشنبیرکردنی خۆیەوە خەریك بێت و، هەوڵی پتەوکردن و لێکنزیکبوونەوەی دەگەڵ دەوروبەری و هەوڵی شرۆڤەکردنی لایەنە شاراوەکانی پەروەردەو فێرکردن بدات و، دەست بنێتە ناو دەستی ئاوەڵ و دەستە براو خوشکەکانی و بەگیانێکی پڕ لە میهرو خۆشەویستی و هەست بە بەرپرسێتی کردنەوە بێتە گۆڕەپانی کارو، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی لەسەر بناغەی پەروەردەیەکی نەتەوەیی و ڕەوشتی قووڵ و بەکەڵك ببێتە نموونەو پێشڕەوی قوتابییان و کۆمەڵ، بەداخەوە زۆریش بەکەسەرەوە دەڵێم و ڕەنگە لە ناچاریشەوە دەستم بۆ نووسینی ئەم چەند دێڕانە درێژ کردبێت، بەڵکە ئێ ئەوە خوایە هەرنەبێ پێش بە تەنینەوەی ئەم ئاگرە سوورە بگرین و خەرمانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و پەروەردەییەکانی لێ بپارێزین :

* مامۆستایەك لە قوتابخانەکەی خۆی نەتوانێت لە کاتی هەبوونی هەر گرفتێکی قوتابی لەگەڵی ڕاوەستێت و چارەسەری کێشە دەروونی و لایەنە پەروەردەیی و زانستەکانی قوتابییەکەی خۆی بکات، هەر لە ترسی ئەوەی نەکات مامۆستایانی دیکەی نەفس نزم و دڵ و دەروون ڕەش و ناڕۆشنبیر، تیرو توانجی تێ بگرن و بڵێن ئەم قوتابییە لەگەڵ مامۆستاکەی پەیوەندی ناشایستەی هەیە .

* مامۆستا نەتوانێت لەگەڵ چەند دەستە براو دەستە خوشکێکی مامۆستای خۆی لە ناو قوتابخانەدا هەڵسوکەوت و گفتوگۆو لێك نزیکبوونەوەیەکی پاك و بێگەردانەی مرۆڤانەو پەروەردەییانەو زانستییانە دروست بکات، هەر لەبەر ئەوەی نەوەکو بەلاقرتێوە سەیر بکرێت و مەبەستە پیرۆزەکانی بۆ بە پەتێکی ڕەشەوەبکەن و بڵێن ئەم ڕەفتارانە ڕەفتاری ناشایستەن.

شتێکەو بەڵگەنەویستە کە هەمیشە مامۆستا هەڵسوکەوت و ڕەفتاری چۆن بێت قوتابییەکانیش هەر بەم جۆرە ڕەفتارانەوە بەرهەم دێن، بۆیە خۆزگە دەخوازم ئەم جۆرە مامۆستایانە بەخۆدا بچنەوەو ڕەفتارو ڕەوشتی خۆیان بگۆڕن و خۆ پەروەردە بکەنەوە، چونکە:

١- مامۆستا دووچاری بێزاری دەبێت و پیشەکەی خۆی لەبەر چاو دەکەوێت.
٢- دەبێتە هۆی ساردبوونەوەی مامۆستا لە کارەکەی کە پرۆسەی پەروەردەو فێرکردنە.
٣- خستنە پشتگوێی قوتابییەکان و بایەخ پێنەدانیان.
٤- دروستبوونی گیروگرفتی لابەلا بۆ بەڕێوەبەری قوتابخانەو تێکچوونی شیرازەی ئیدارە.
٥- لەدەستدانی ڕێزو خۆشەویستی لە نێوان مامۆستایانداو کەمبوونەوەو نزم سەیرکردنی کەسایەتی ئەو مامۆستایانەی گیروگرفت دروست دەکەن و هەست بە بەرپرسیەتی خۆیان و بایەخی کارەکەیان ناکەن.
٦- دەستەوەستانی ئیدارەی قوتابخانە لەچارەسەرکردنی ئەم جۆرە گیروگرفتانە.
٧- لاوازبوونی ئاستی پەروەردەیی و فێرکردن و لەبەرچاوکەوتنی مامۆستایان لەلای قوتابییان و بەهەند هەڵنەگرتنی ئامۆژگارییەکانیان.
٨- هۆیەکی هەرە گرنگە بۆ نزمبوونەوەی ڕێژەی دەرچوونی قوتابییان لە تاقیکردنەوەکاندا.

لێرەوەش دەتوانم بڵێم دروستبوونی ئەم جۆرە دیاردانەش و سەرهەڵدانیان بۆ بێئاگایی بەڕێوەبەری قوتابخانە دەگەڕێتەوە. کەدەتوانێت لایەنی چاك و

لایـەنی خراپـە وەك ناوبـژیوانێك ببینێـت، نـەك لایـەنی چـاك فـەرامۆش بكـات و هــیچ بایــەخێك بــە ڕوودانــی ئــەم جــۆرە دیــاردەو گرفتانــە نــەدات. دەبێــت بەڕێوەبـەر لـە بـوونی هـەرگیروگرفتێك یـان بـوونی هەرشـتێك، كـە پەیوەنـدی بـە مامۆســتاو قوتابییــان و قوتابخانــەوە هــەبێت، ئاگــاداری گشــت مامۆســتاكانی بكات بۆ ڕاوێژكردن تا وەكو كێشەكە چارەبكات.

جا كـاكی بەڕێوەبـەر لـە گرفتـەكان خـۆ مـەدزەوە ڕووبـەڕووی گرفتـەكان ببـەوە، تـا قوتابییـەكان و مامۆسـتاكانت و قوتابخانەكـەت بـەرەو هەڵـدێر نەچـن. دواجـار دەڵێم ئەگەر بێـت و گرفتـەكان ڕوو لـە چـاكی نـەبن، ڕەنگـە ناچـاربم خـاڵ لەسـەر پیتەكان دابنێم و زەقـاو زەقـتر كـات و شـوێنی ئـەم جـۆرە دیـاردەو گرفتانـە بـاس بكەم و لەبنی دەهۆڵێ دەم !!. •

---

• لە ئاسۆی پەروەردەیی (ژمارە ٥٧) تەمموزی ٢٠٠٥ بڵاوكراوەتەوە.

# قوتابخانەو جگەرەکێشانی مامۆستایان

**ن / شواڕێ**

لە ئەنجامی گەلێك لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە کە هۆی سەرەکی شێرپەنجەی سییەکان و سووتانەوەی بۆڕییەکانی و ئاوسانی سی و شێرپەنجەی قوڕگ بۆ جگەرەکێشان دەگەڕێتەوە. سەرژمێرییە زانستییە باوەڕپێکراوەکان لە چەند وڵاتێك سەلماندوویانە، مردن بە هۆی شێرپەنجەی سییەکان لە زۆربووندایە، بە تایبەتی لای پیاوان، ئەویش بەهۆی زۆر جگەرەکێشانەوە. هەر ئەو لێکۆڵینەوانەش ساغیان کردووەتەوە، ڕێژەی تێچوونی تووشبوون بە شێرپەنجەی سییەکان بە پێی ڕێژەی ژمارەی جگەرەکێشان زۆر دەبێت، چونکە ئەگەری تووشبوون بە شێرپەنجەی سی لەو کەسانەی جگەرە دەکێشن،

نزیکەی (١٥-٣٠) جار لەو کەسانە زۆرترە کە جگـەرە ناکێشـن، بـەڵام زۆر ڕوون و ئاشکرایە ئەگەر جگەرە نەکێشیش لـەلای جگەرەکێشـەوە دابنیشـێت هـەر هـەمان ژەهرو دووکەڵە، کە هەڵیدەمژێت. ئـەم ڕێژەیـە لـەو جگەرەکێشـانەی لەمنداڵییـەوە دەستیان پێکردووەو قونکە جگەرەکـەش بـەکاردێنن کـە زیـانی لەبەشـی پێشـەوەی زۆرترەو لە ئەنجامی توێکاری سـییەکانی جگەرەکێشـەکان دەرکـەوتووە کـە گـۆڕانی شانەیی لە هەردوو سی و بۆڕییەکانی هەوا ڕوویداوە، بەڵام ئەو گۆڕانە شانەییانە لـەو کەسانەدا کە جگەرە ناکێشن نییە یاخود کەمە. هەر ئەو جگەرەیە کە دەبێتـە هـۆی نەخۆشییەکانی شێرپەنجەی لچ و لێوو زمان. جگـە لـەوەش ئـارەزووی خـواردن کـەم دەکاتەوە و هەستی تام و چێژ لاواز دەکـات، بـەوەش مـرۆڤ یـەکێك لـە هەسـتیارە گرنگەکانی کە خودا پێی بەخشیوە لە دەست دەدات .

سەرەڕای کاریگەری لەسەر ددان و تێکدانی و ئینجا زوو کەوتنیان، جگەرەکێشـان ڕاستەوخۆ کار لە ئەندامانی کۆئەندامی هەرس دەکات و دەردراوەکانی هەرسی گەدە کەم دەکاتەوەو دەبێتە هۆی بەدهەرسی، پەیوەندییـەکی ئاشـکراش هەیـە لـە نێـوان جگەرەو برینی گەدەو دوازدەگرێ. تووشبووان کە جگەرەکێشن زۆرتر هەست بە ئـازار دەکەن ، بۆیە دەرمان خواردن کەمتر سوودی دەبێت ئەمەش دەبێتە هۆی دواکـەوتنی سارێژبوونی برینەکەیان. جگە لەوەش لێکۆڵینەوە نوێیەکان، دەریانخستووە کە مـردن لە ئەنجامی نەخۆشییەکانی دڵ و خوێنبەرەکانی، لەو نەخۆشـیانەش سـنگەکوژێ زۆر دەبێت لەجگەرەکێشە خووپێوەگرتووەکانی دا. دەریشکەوتووە جگەرەکێشانیش زیانی بۆ کۆئەنـدامی سـووڕی خـوێن واتـا ( کۆئەنـدامی سـووڕان ) یـش هەیـە، چـونکە جگەرەکێشـان توانـای هـەڵگرتنی ئۆکسـجینیان لـە (١٠٪) لەجگەرەنەکێشـەکان کـەمترە. بـەهۆی پەیوەنـدی نێـوان هیمۆگلـۆبین و دووەم ئۆکسـیدی کـاربۆن، کـە

لەجگەرەکێشان پەیدادەبێت، بە نزیکەی لە (١٠٪) لە خوێنی جگەرەکێشەکان ئەمەش توانای هیمۆگلۆبین کەم دەکاتەوە لەیەکگرتنیدا لەگەڵ ئۆکسجین، لەوکاتەی کە پێویستە بۆ بەردەوامی ژیان، بۆیە جگەرە پەیوەندییەکی بەهێزیشی بەنەخۆشییەکانی خوێنبەری تاجییەوە هەیە، کە خۆراك دەری دڵە و هۆی گرنگی مردنی تەمەن مام ناوەندییەکانیش لەڕووی کاری جگەرەکێشان و بەبەرزبوونەوەی پەستانی خوێنیش، تا ئێستا بەشێوەیەکی باوەڕپێکراو ساغ نەبووەتەوە، بەڵام هەندێك نیشانە هەن کە دەبنە هۆی ڕەقبوونی خوێنبەرەکانی، خۆ ئەگەر بێت و تووشی خوێنبەرەکانی مێشك ببێت، ئەوا دەبێتە هۆی مردنی یان ڕوودانی سنگەکوژێ. ئەگەر ماسوولکەی دڵ بە گوێرەی پێویستی خوێنیان نەدرێتێ یان دەبێتە هۆی نیوە ئیفلیجی یان نەخۆشی گێڕی ئەگەر تووشی خوێنبەرەکانی لاق بن. یان دەبێتە گانگرین و دەبێت ببڕدرێتەوە، هەروەکو هەڵچوون کار دەکەنە سەر هەندێك کوێرە ڕژێنەکان وایان لێ دەکەن جۆرە ماددەیەك بڕێژن لینجی پەڕەکە خوێنبەرەکان زیاد بکەن و کەڵەکە بن، بەوەش یارمەتی مەیینی خوێن دەدەن، جگە لەوەی کە چەورە ترشەکانیش لە خوێندا خەستتر دەکەن و شێوان و خورپەو لێدانی دڵ زیاد و ناڕێك دەکەن.

ڕوون و ئاشکرایە، کە پیشەی مامۆستایەتی پیشەیەکی ئەو پەڕی دڵسۆزانەیە بە گەل و نیشتمان، ئەوەی جێی سەرنجە و بۆتە دیاردەیەکی زیانبەخش، کە لێرەو لەوێ لەبەردەم قوتابییان و لە ژووری پۆلێ لەکاتی وانەگوتنەوە و لە گۆرەپانی قوتابخانەو لەکاتی پشووی قوتابییان لەژووری هەندێك مامۆستایاندا جگەرە دەکێشن، ئاخۆ مامۆستایەك ، دەتوانێت پەروەردەیەکی ڕاست و دروستی قوتابییان بکات و ئامۆژگاری هەرتاکێکی قوتابییان بکات لەسەر ڕەفتارێك کە بەناشایستەی دەزانێت،

کەچی هەمان ڕەفتار لە خودی خۆیدا ڕەنگ بداتەوە؟. ئەگەر مامۆستا وانەی زانستی گوتەوە و بابەتی زیانەکانی جگەرەکێشانی هەبوو و خۆی جگەرەکێش بێت ، ئەوا چۆن وانەکە دەڵێتەوە یاخود لەسەر جگەرەکێشان بەردەوام دەبێت و بێ ئەوەی هیچ گوێ بە بارودۆخی دەروونی قوتابییان بدات ، ئاخۆ ئەمە ڕاستە ..!؟ لە بری ئەوەی کە تۆ ئامۆژگاری قوتابییان بکەیت کەوا جگەرەکێشان شتێکی بێ مانایەولە زیان بەولاوە هیچی دی نییە . جگەرە خۆی لەخۆیدا ، زیان بەخشەو تووشی چەندان نەخۆشی جۆراوجۆرمان دەکات . جا کە جگەرەیەك ئەم هەموو زیانانەی هەبێت ، تۆ چۆن دەتوانیت لەبەردەم ئەم هەموو منداڵە چاوگەشەی دواڕۆژی گەلەکەتدا ئەم منداڵە بێ نازانەی کەوا پارچەیەك لە جەرگی تۆن بە دووکەڵی جگەرەکەت هەوای ساف و بێگەردیان لێ بکەیتە ژەهری مەرگ ؟ دواجار ئاخۆ دەزگا پەروەردەییەکان لە هەرێمی کوردستاندا چ چارەسەرێکییان بۆ قەدەغەکردنی ئەم دیاردەیە لەلایە ؟ **

---

** لە گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی ( ژمارە ٥١) کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ بڵاوکراوەتەوە .

# بەرپرسیارییەکانی بەڕێوەبەری قوتابخانە

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو دەبێ ئەو خەسڵەتانەی خوارەوەی تێدابێت کە بریتین لە :

١- ئاگاداری هەموو قۆناغ و ئامانجەکانی خوێندن بێت و تێیان بگات و خەسڵەتی قوتابییەکانی بەگوێرەی سیاسەتی پەروەردەو فێرکردن بزانێ .

٢- ئامادەکردنی زەمینەیەکی دڵنیاو باش بۆ بنیاتنانی کەسایەتی قوتابی و گەشەکردنی لەهەموو لایەنەکانەوەو چاندنی تۆوی رەوشت و خەسڵەتە باشەکان تێیدا.

٣- چاودێری و بەسەر ڕاگەیشتنی هەموو کەل و پەل و جومگەکانی قوتابخانە و ڕێکخستن و ئامادەکردنیان بۆ بەکار هێنان وەك : ( وەرشە و تاقیگا ، و ناوەندی

سەرچاوەکانی فێربوون ، و هۆڵی چالاکییەکان و یاریگا و ئامێرەکانی هەوا گـۆڕین و ئاوساردکەرەوەکان و گەلێ شتی تـریش (.. و ڕێکخسـتنی پۆلـەکان و دابەشـکردنی قوتابییان بەسەریاندا .

٤- خـۆ ئامـادەکردن و ڕێکخسـتنی هـەموو شـتە پێویسـتەکان بـۆ دەسـت بەخوێندنکردنێ لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا و دانانی پلانی کار بۆ ئیش پێکردنی لـە قوتابخانـەدا ، و دانـانی خشـتەی وانـەکان ، و دابەشـکردنی کاروبـارو بەرنامـەی چالاکییەکان بەسەر هەموو ئەوانەی لە قوتابخانەکەدان و دانانی ئەنجوومەن و لیژنەکان لە قوتابخانەدا و چاودێری و بە دواداچوونی ئەنجامدانی کارەکان بە گوێرەی ڕێنمایی یا پێویستیەکانی قوتابخانە.

٥- بەسەر ڕاگەیشتنی مامۆستایان و سەردانیان لە پۆلەکاندا و ئاگاداربوون لـەکارو چالاکی و بەشدارییەکانیاندا.

٦- هەڵسەنگاندنی ئەرکی کارفەرمایانی قوتابخانە، بەگوێرەی ئەو ڕێنماییانەی بـۆ ئەو هەڵسەنگاندنانە دانراون زۆر بەوردی و بابەتیانـە و دڵنیـا بـوون لـەو بەڵگانـەی پشتگیری هەڵسەنگاندنەکان دەکەن لە دانی ڕێزو سوپاس و پاداشتەکاندا .

٧- هاوبەشی کردن لە گەشەی پیشـەیی مامۆسـتایەکاندا لـە ڕێـی هەسـتکردن بـە پێویسـتیە مەشـقیەکان و پێشـنیارکردنی بەرنامـەی گونجـاو و بەدواداچـوونی بەشداریکردنی مامۆستا لەو بەرنامانەی پێویستی پێیانـە لـە نـاوەوەو لـە دەرەوەی

قوتابخانەدا، و هەڵسەنگاندنی هـەژموونی  جێبـەجێ کردنەکـەیان و هاریکـاریکردن لەگەڵ سەرپەرشتیاری پسپۆڕی پەروەردەیی لەم بارەیەوە.

٨- هاوکـاریکردنی سەرپەرشـتیارە پەروەردەییيـەکان و یـا ئەوانـەی کارەکانیـان سـەردانی قوتابخانــە دەخــوازێ و ئاســانکردنی کاروبارەکانیــان و بــە دواداچــوونی جێبەجێکردنی راسپاردەو ڕێنماییەکانیان لەگەڵ تێبینی دەست پێشخەری بانگهێشتی سەرپەرشتیاری پسپۆر لە کاتی پێویستیدا.

٩- بەرزڕاگرتنی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی قوتابخانەو کردنەوەی ئاسۆی هاریکاری تەواو لـە نێوان قوتابخانەو کەسوکاری قوتابییان و هەموو ئەوانەش کـە دەسـتێکیان هەیـە لـە هاوبەشی هێنانەدی ئامانجەکانی قوتابخانەدا.

١٠- پتەو کردنی پەیوەندییەکان بـە کەسـوکاری قوتابییانـەوە و بانگهێشـتیان بـۆ ئاگاداربوون لە بـارو دۆخـی منداڵـەکانیان و پێڕاگەیانـدنی تێبینـی و سـەرنجەکانی قوتابخانە پێیان دەربارەی هەڵس وکەوت و رەفتار و ئاستی فێربوونیان و ڕاوێژ لەگـەڵ کردنیان بۆ چارەسەری هەر گرفتێکی کە لەوانەیە بێتە پێش منداڵەکانیان .

١١- وەگەڕخستنی ئەنجوومەنەکانی قوتابخانە و ڕێکخستنی کۆڕو کۆبوونەوە لەگـەڵ دەستەی بەڕێوەبەرانی قوتابخانە بۆ لێدوان لە لایەنە پەروەردەیی و رێکخستنەکانەوە ، و دڵنیابوون لە جێبە جێکردنی کاروبارەکانی هەریـەکێك لـە وانـەی کـە کـاری پـی

سپێردراوە، و لەگەڵ تێبینی نووسینی هەموو ئەو کارانەی کە دەبێ بکرێن و بە دواداچوون بۆ جێبەجێکردنیشیان بکرێت .

١٢- بەشداریکردن لە هەموو ئەو کۆبوونەوە و چاوپێکەوتن و بەرنامە مەشقیانەی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە یان سەرپەشیاری پسپۆر بە چاکی دەزانن .

١٣- ئاگادارکردنەوەی دەستەی مامۆستایان لەو ڕێنمایی و راسپاردەو پرۆژە و یاساو ڕێسایانەی لەلایەنی پەروەردەوە دەردەچن و گفتوگۆ لەسەرکردنیان لەگەڵ مامۆستایاندا بۆ زانین و تێگەیشتنی ناوەرۆکەکانیان و کارپێکردنیان، ئەمەش لە ڕێی کۆبوونەوەیەکەوە دەکرێ کە بۆ ئەم مەبەستە ساز دەدرێ .

١٤- سەرپەرشتی کردنی بەرنامەکانی ئاراستە و ڕێنماییەکانی قوتابخانە و گرنگی پێدانیان و بە دواداچوونی بەرنامە و پلانی چالاکییەکان و هەڵسەنگاندنیان و هەوڵدان بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی.

١٥- سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی ئاو و کارەبا و جەخت کردنەوە لەسەر سەلامەتی بەکارهێنانیان و هەبوونی مەرجە تەندروستیەکان و بانگهێشتی پسپۆڕی ئەو بوارانە لەکاتی پێویستدا بۆ دڵنیابوونی سەلامەتییان .

١٦- سەرپەرشتی کاروباری تاقیکردنەوەکان بە گوێرەی پرۆژە و دەستورەکان و بە دواداچوون و توێژینەوەی بەرەنجامی تاقیکردنەوەکان و شیتەڵکردنیان و هەنگاو هەڵێنانی پێویست بۆ جێبەجێکردنیان .

١٧- سەرپەرشــتی کردنــی بەرنامــەی ریزبــوونی بــەیانیانی قوتابییــان و ڕێنمــایی کاروبــاری ڕۆژانــەیان و جەختکردنــەوە لەســەر ڕێــك و پێکــی و تــەواویی هــەموو لایەنەکانی و نەهێشتنی کۆسپ و تەگەرەکانی بەردەمی و لێ پیچــینەوە لــەوەی کــە هەموو تاکێکی ناو قوتابخانە ئــەرکی پــێ ســپێردراوی سەرشــانی خــۆی بەتــەواوەتی بەجێهێناوە.

١٨- بەسەر کردنەوەی قوتابخانە و هەموو کەل وپەلەکانی، دلّنیابوون لە پاکو خاوێنی و سەلامەتی و دیمەنی جوانیان. کردنــەوەو تــەرخانکردنی تۆمــار ( ســجل ) ێـك بــۆ ساختمان ( بینایە) ی قوتابخانەکە و کاروباری پاراستنی و دەست پێشــخەریکردن لــە ئاگادارکردنەوەی پەروەردە لە هەر کەموکووڕی و نالەبارییەکی ساختمانەکە کە جێــی مەترسی بێ.

١٩- دەستوبردیی لە وەلاّمدانەوەی ئەو نووسراوانەی کە بــۆ قوتابخانــە دێــن، لەگــەڵ تێبینی گرنگیدان بە وردەکاری ڕێنماییەکان و ڕوونییان.

٢٠- پێشکەشــکردنی ڕاپۆرتێــك لــە کۆتــایی هــەموو ســاڵەکانی خوێندنێــدا بــە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە، کە هەموو ئەو شتانە بگرێتەخۆ کە لەو ساڵەدا کــراون — ئەمە سەرەڕای ئەو شتە بەرچاوانەی قوتابخانە بەچاکیان دەزانــێ بــۆ بەرەوپێشــبردنی کارەکانی قوتابخانە بە تایبەتی و لە قوتابخانەکانی تر و لــە پــەروەردەو فێرکردنیشــدا بەگشتی .

٢١- ئامادەكردنی یاریدەدەری بەڕێوەبەر بۆ ڕاپەڕاندنی كاروبارەكانی بەڕێوەبەری قوتابخانە لەكاتی پێویستدا، بۆ نموونە یاریدەدەر بتوانێ سەردانی مامۆستایان بكات و بەدوای چۆنیەتی وانە وتنەوەكانیاندا بچێ و سەرۆكایەتی هەندێ لیژنە و زۆرشتی تریش بكا .

٢٢- ئەو وانانە بڵێتەوە كە بە گوێرەی دەستوور بۆی دادەنرێت.
٢٣- ئەو كاروبارانەش ئەنجام بدات كە پەروەردە بۆی دیاری دەكات، بە مەرجێ لەگەڵ سروشتی كاری پەروەردەو فێركردندا بگونجێ.

٢٤- بەڕێوەبەری قوتابخانە بایەخی تایبەتی بە مامۆستای تازە بدات و هەموو ئەو ڕێنمایی و ڕاسپاردانەی بداتێ كە پێویستی پێیانە، لە كاتی ئەنجامدانی ئەركەكانیدا بە دەنگیەوە بچێ و بنەڕەتی كارەكانی پێشان بدات، و یارمەتی هاوبەشیكردنی چاوپێكەوتنەكان و بەرنامە چالاكییەكان و خولە پەروەردەییە مەشقیەكانی بدات كە تایبەتن بە مامۆستای تازەوە.

٢٥- بەڕێوەبەر چاودێریی و بە دواداچوون بۆ مامۆستای تازە بكات و هەڵیبسەنگێنێ، ئەڵبەتە ئەمەش بە گوێرەی ئەو ڕێنماییەتایبەتیانە دەبێ كە بۆساڵی تاقیكردنەوە دانراون ، و سەردان و ڕێ پێشاندانەكانیشی لە تۆمارێكدا بەناوی ( تۆماری بەڕێوەبەری قوتابخانە بۆ بە دواداچوون و هەڵسەنگاندنی مامۆستا ) بنووسێت و هەموو تێبینیەكانیش دوای هەر سەردانێك بە نووسراو مامۆستاكەی لێ ئاگادار بكرێتەوە و پێی ڕابگەیەنرێت. بەم شێوەیە هەڵسەنگاندنی ئەركی

فەرمانبەریەتی تایبەت بە مامۆستا لە کاتی دیاریکراودا بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە دەنێردرێ وبیروڕای بەڕێوەبەری تێدا ڕوون دەکرێتەوە دەربارەی ئەوەی ئاخۆ تا چەند ئەو کەسە بۆ مامۆستایەتی دەشێ، یان بیگوازنەوە بۆ سەر کارێکی دیکە .

٢٦- بەڕێوەبەری قوتابخانە هەموو دواکەوتن و نەهاتنێکی مامۆستا و تەواوی کارمەند و خزمەتگوزارەکانی قوتابخانە لای خۆی دەنووسێت، و هەرچی ڕێگایەکی دەستووری هەیە دەیگرێتە بەر، هەر لە نووسینی تێبینیەکانەوە بیگرە تا دەگاتە لێکۆلێنەوەو لێپرسینەوە لە دەفتەری دەوامی ڕۆژانەدا.

٢٧- ڕێگای پێویست بگرێتەبەر لە بڕینی پارەی رۆژانی نەهاتن لە مووچەی مامۆستا یا فەرمانبەری قوتابخانە، ئەوەش لەسەر بنەمای هەقدەست لەبەرامبەر کاردا .

٢٨- هەر نەهاتن یا دواکەوتنێك لە قوتابخانەدا رووبدات، بینووسێت بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە، و ئەوەی بەباشیشی دەزانێ لەو بارەیەوە بینووسێ .

٢٩- بەڕێوەبەر هەموو ئەو تێبینییانەی لە سەرهاتن و دواکەوتن لەلای خۆی نووسیونی، لە کاتی هەڵسەنگاندنی ئەرکی فەرمانبەریەتی مامۆستایان و کارگوزارانی قوتابخانەدا، بیانخاتە بەرچاو، کە لەکاتی داواکردنی راسپاردەکاندا بۆ کارێکی پێشەنگی یا بەشداری خولێکی پەروەردەیی و مەشق، یا ناردنی دەرەوەی وڵات بۆ وانە وتنەوە یا هەر هەلێکی رەخساوی تردا، ئیشیان پێی دەبێت.

٣٠- بەرێوەبەری قوتابخانە بەر لەسەرەتای هەر ساڵێکی خوێندن پلانێکی کاری دوورودرێژ بۆ خۆی ئامادە بکات کە بڕیارە وەك ئەرکێك جیبەجێی و پۆلێن و دابەشیان بکات بەسەر (ڕۆژ و هەفتە و مانگ و وەرز– و ساڵەکەدا). و بەشێوەیەکی دەوری و بەگوێرەی کارتێك (کارتی هەڵسەنگاندنی خودی بۆ کاری بەڕێوەبەری قوتابخانە) و ناوەناوە بەسەریاندا بچێتەوە و بزانێ داخوا چی کردووە و چی نەکردووە). [θ]

---

[θ] سەرچاوە : لە www.Yahoo .com کراوە بە کوردی

لە ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٣٩٦٩ ) لەبەرواری ٢٠١٢/١/١٥ بڵاوکراوەتەوە.

# بەڕێوەبەری قوتابخانە سەرپەرشتیارێکی پەروەردەیی ئاکنجە

بەڕێوەبەری قوتابخانە بە سەرکردەیەکی پەروەردەیی دادەنرێت لە قوتابخانەکەیدا . ئەو ڕۆڵەشی ئەوەی لەسەر دەکاتە مالٌ کە بەڕێوەبەر زۆر ئەرکی بەڕێوەبردن و کاروباری هونەری ڕاپەڕێنێ و جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە کە کاروباری بەڕێوەبردن هەمیشە لە خزمەتی کاروبارە هونەرییەکاندایە و هەر لەم رووەوەش کە سەرپەرشتیی پەروەردەیی لایەنێکە لە لایەنی بەڕێوەبردنە پەروەردەییەکان کە کرنگی بەلایەنە هونەرییەکان دەدات لە قوتابخانەدا کەواتە بەڕێوەبەر لە یەکێك لە گۆشەکانەوە سەرکردەیەکی پەروەردەیی قوتابخانەکەی خۆیەتی . ئەو هەر تەنیا بەڕێوەبەر و کارگێڕێك نیە و بەس

بەڵکــە سەرپەرشــتیارێکی پــەروەردەیی ئاکنجــە ( جــێگیر ) هــەر بۆیــە کارەکــانی بەرێوەبەر ئەم لایەنانە دەگرێتەوە :

١- بەرەو پێشبردنی مامۆستایان و پێگەیاندنی پیشەییانەیان.

٢- چاك بەجێگەیاندنی بەرنامەکانی قوتابخانە .

٣- قوتابییان

٤- ساختمانی قوتابخانەو پاشکۆیەکانی .

٥- ژینگە و کۆمەڵگای خۆجێی .

وە دەتوانری ئەو ئامانج و مەبەستانە لە ڕێی بەڕێوەبەری قوتابخانــەوە بهێنرێنــە دی بەوەی کە بەڕێوەبەر خەسڵەتێکی هەڵسوڕاندنی ئەو تۆی کارگێڕیان بداتێ کە هــەموو ئەم لایەنانەی خوارەوە بگرێتەوە :

١- پلان

٢- جێبەجێ کردن

٣- بەدواداچوون

٤-هەڵسەنگاندن

**یەکەم/ پلان :**

کە ئەمە توخمی سەرەکییە لە وەدیهێنانی دروستی ئیشوکارەکانی بەڕێوەبردن چونکە هەڵسوراندنی ئەو ئیش وکارانە دەبێ زۆربەوردی نەخشەوپلانی بەرلەدەست پێکردنــی ساڵی تازەی خوێندن بۆ دابنرێت . بۆیە دەبێ بەڕێوەبەری قوتابخانــە پلانێکــی کــاری ئەوتۆ دابنێ هەموو ئەو کاروچالاکییەکارگێڕییانە لە خۆبگرێ کە دەیهەوێ هــەر لــە سەرەتای دەست پێکردنی خوێندنێوە تاکۆتایی ساڵەکە بیانکات.

## دووەم / جێبەجێ کردن :

لەم قۆناغەدا هەرچی پێویستیە کارگێڕیە پێشنیارکراوەکانە دەخرێنە خانەی جێبەجێ کردنەوەو بەڕێوەبەری قوتابخانەش بە گوێرەی ئەم قۆناغانەی خوارەوە لەسەری دەڕوا :

### أ- کاروبارە کارگێڕیەکان لەسەرەتای ساڵی خوێندنەوە :

دەست پێکردنی ئەو کاروبارانەش هەر لەسەرەتای ساڵی خوێندنەوە ئامادەو پێداچوونەوەیەکی زۆرباشی بەڕێوەچوونی ئەو کارانەی گەرەکە کە بریتین لە :

١- جەخت کردنەوە لەسەر پڕکردنەوەی پێویستی قوتابخانە بە مامۆستای پسپۆر .
٢- بەڕێوەبەری قوتابخانە لەوە ئەرخەیان بێت کە ئەو کارگێڕانەی قوتابخانە پێویستی پێیانە لە قوتابخانەکەدا هەن و ژمارەکەیان هێندە هەیە بەشی ڕاپەراندنی کاروبارەکانی قوتابخانە بکا .
٣- بەڕێوەبەر دڵنیابێ لەوەی کە هونەروەرییەکان ( الفنیون ) بە تەواوی هەن . لەوانەش هونەروەریی ( الفنی ) تاقیگا و هونەروەریی هۆیەکانی فێرکردن و ئیدیکەی لەوانە کە کاروباری پەروەردە پێویستی پێیانە هەبن .
٤-دڵنیابوون لە گەیشتنی هەموو کتێبە بڕیار لێدراوەکانی خوێندنێ و دڵنیا بوون لەوەی کە بەشی هەر هەموو قوتابییەکان دەکات و دڵنیابوونەوە لەوەش کە کتێبەکان هەمان ئەو کتێبانەن کە بڕیاری خوێندنیان لەسەر دراوە .

٥- دڵنیابوون لە هەبوونی ئامێروکەل و پەل و هۆیەکانی فێرکردنی گونجاو و لەبار بۆ بەرێ خستنی پرۆسەی فێرکردن و پاراستنیان و چاککردنەوەی ئەوانەی پێویستیان بەچاککردنەوەیە .

٦- دڵنیابوون لەوەی کە ساختمان ( بنایە ) ی قوتابخانەکە بە گوێرەی ژمارەی هۆڵ و گونجانی بۆ خوێندنی قوتابییان دەست دەدەن هەروەها تەواو کردنی کەل و پەلەکانی ناوەوەی بۆ بەکارهێنان .

٧- دانانی خشتەی وانەکانی قوتابخانە کە هەموو ئەو کتێبانە بگرێتەوە کە دەبێ قوتابییان بیانخوێنن لەگەڵ لەبەرچاو گرتنی کاتی خوێندنی هەر وانەیەك و دابەشکردنی وانەکانیش بەسەر رۆژەکانی هەفتەدا .

٨- پێداگرتن لەسەر هەبوونی کۆمەڵە تۆمارێکی قوتابخانە کە هاوبەشی لە رێکخستنی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی قوتابخانەدا دەکا .

## ب- هەلسووڕاندنی کاروبارەکانی. ساڵی خوێندنێ :

١- کۆبوونەوە کارگێڕیەکان لەگەڵ مامۆستایاندا بۆ بە دواداچوونی کێشە و پرسە کارگێڕییەکانی کە پەیوەندییان بە قوتابخانەو رێکخستنیەوە هەیە .

٢- چاودێری کردنی دەوامی مامۆستایان لە بارەی پا بەندبوونیانەوە بەسات و کاتی ئەو وانانەی بە گوێرەی خشتەی وانەکانی قوتابخانە کە بۆیان دانراوە بیلێنەوە .

٣- چاودێری کردنی دەوامی قوتابییان.

٤- چاودێری کردنی دەوامی کارگێڕو بەردەست و هونەروەرەکان ( الفنیین)

٥- دابین کردنی توانای دارایی پێویست بۆ قوتابخانە.

٦- نووسینی ڕاپۆرت بۆ بەڕێوەبەریەتییەکانی پەروەردەو فێرکردن بە مەبەستی روونکردنەوەو پێشاندانی بەڕێوەچوونی خوێندن و ئەو تەنگوچەڵەمەوگرفتانەی دێنە پێش پرۆسەی پەروەردە و پێویستیەکانی قوتابخانە بە مامۆستا و ئاسانکردنی کارە داراییەکان .

٧- پاراستنی ساختمان ( بنایە ) ی قوتابخانەو جومگەکانی .

٨- ڕووبەڕوو بوونەوەی گیروگرفتە لەناکاو و کتوپڕەکان .

٩- ڕێکخستنی پرۆسەی پەروەردەیی قوتابخانە لەڕێی کاری لێژنە جۆراوجۆرەکانی مامۆستایان و قوتابییانەوە بۆ وەڕێ خستنی پرۆسەی پەروەردە .

## ج – کاروبارەکارگێڕییەکان لە کۆتایی ساڵدا :

ئەو کاروبارانەش ئەم لایەنانەی خوارەوە دەگرنەوە :

١- خۆ ئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەکان و جیبەجێ کردنیان .

٢- چاودێری بەڕێوەچوونی تاقیکردنەوەکان ( ئەزموونەکان ) .

٣- سەرپەرشتیکردنی راستەوخۆی تەماشاکردنی دەفتەری ئەزموونی قوتابییەکان و هەڵوێستە لەسەرنمرەکان .

٤- سەرپەرشتیکردنی ئەنجامەکان و ڕێکخستنی گەواهی نامەکان و توێژینەوە لە نمرەکان بە گوێرەی سیستەمی پەیرەوی کراو.

٥- وەرگرتنەوەی کەل و پەل و ئامێرەکان لە مامۆستایان

٦- بژاردەکردنی کتێبەکانی قوتابخانە .

٧- وەرگرتنەوەی تۆمارە فەرمییەکان لە مامۆستایان و کارگێڕەکان.

٨- نووسینی ڕاپـۆرتێکی تێـر وتەسـەل لـە بـارەی سـاڵی خوێندنەکـەوە وهـەروەها نووسینی پێشنیار بۆ چاککردنی بەڕێوەچوونی پرۆسەی کـارگێڕی لەسـاڵی خوێنـدنی داهاتوودا.

**سێهەم / بە دواداچوون :**

هـیچ پـلان و ڕیکخسـتنێك کاریگەرییـەکی ئەرێیانـەی ئـەوتۆی نابـێ ئەگـەر بـە دواداچوونێکی ڕێکوپێکی لەکات و ساتی جیاوازدا بە دواوە نەبێ .

بەدواداچوون ئەمانە دەگرێتەوە :

١- بەدواداچوونی پلانی کارو ڕێکخستنەوەی قوتابخانە .

٢- بەدواداچوونی کاروبارەکانی دەستەی مامۆستایان و کـارگوزار و بەردەسـتەکان و تۆمارکردنی هەرچی تێبینییەکانە لە تۆمارێکی تایبەتیدا .

٣- بەدواداچوونی ئاستی مانگانەی قوتابییان .

٤- بەدواداچوونی جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی ئەنجومەنی قوتابخانە.

٥- بەدواداچوونی راستکردنەوەی کارەکانی قوتابییان .

٦- بەدواداچوونی چالاکییەکانی قوتابخانە.

٧- پشکنینی ئیش وکاروبارە دارایی و کارگێڕییەکان و جارجارە بەسەرکردنەوەیان.

٨- بەدواداچوونی کارگوزارییەکانی ناو قوتابخانە .

**چوارەم / هەڵسەنگاندن :**

لەوانەیە گرینگترین لایەنەکانی پەروەردە هەڵسەنگاندنی کارمەندانی قوتابخانەو قوتابییەکان بێت بەرێگایەکی زانستیانەی شیاودا تا ئەو سوود و ئامانجە چاوەڕێکراوانە لە پرۆسەی فێرکردندا وەدی بێنێ . توخمەکانی بەهێزکردنیش بریتین لە:

١- هەڵسەنگاندنی قوتابییان .

٢- هەڵسەنگاندنی پرۆگرام و کتێبەکانی خوێندنێ .

٣- هەڵسەنگاندنی کاروبارەکانی پێشتر و ئەنجومەنەکانی قوتابخانە .

٤- هەڵسەنگاندنی توانا ماددی و مرۆییەکانی قوتابخانە.

٥- نووسین و بەرزکردنەوەی راپۆرتی وەرزی و ساڵانە لە قوتابخانەوە بۆ پسپۆڕان .

بەگەڕانەوەمان بۆ بواری کاروبارەکانی بەڕێوەبەری قوتابخانەو زۆر بە کورتی ئەوەمان دێتە بەرچاو :

**یەکەم .. ڕۆڵی بەڕێوەبەری قوتابخانە لە بەرەوپێشبردن و پێگەیاندنی پیشەییانەی مامۆستایاندا مەبەست بەرزکردنەوەو پێگەیاندنی ئاستی زانیاری مامۆستایان و بەرەوپێشەوەبردنی توانای فێرکردنیانەکە. دوولایەن دەگرێتەوە، زانیاری و رەفتاری.**

**لایەنی زانیارییەکەی بریتییەلە :**

١- زانینی خەسڵەتە دەروونی و لەشی و کۆمەڵایەتییەکانی قوتابییان و چاودێری کردنی ئەو خەسڵەتانەش لە پرۆسەی فێربووندا .

٢- زانیاری و ڕاستیە زانستییەکانی ناوکتێبەکانی خوێندنێ کە دەیانڵێتەوە .

٣- زانینی پێویستیە کۆمەڵایەتی و ئابووری و زانستییەکانی کۆمەڵگا .

٤- زانینی ئەو بناغە و شەنگستانەی پرۆگرامەکانی خوێندنێی لەسەر دادەنرێت .
٥- زانینی ڕێگا گونجاوەکانی وانەوتنەوە بۆ ئەو وانانەی دەیانڵێتەوە .
٦- زانینی ئەو دۆزینەوە زانستی و ئەدەبییانەی یارمەتی دەدەن لەکارەکەیدا.
٧- بەشداریکردنی لە خولێکی چاك جیبەجی کردنی پڕۆگرامەکانی خوێندندا .
هەروەها لایەنە ڕەفتاریەکەشی بریتیەلە :
١- توانای هەڵسوڕاندنی ژووری پۆل .
٢- توانای مامۆستا بە دانانی پلانێك بۆ وانەکانی لە هەر یەکێك لەم سێ ئاستانەدا ( سالآنە و رۆژانە ومانگانەی خوێندندا )
٣- توانای مامۆستا لە بەکارهێنانی هۆیەکانی فێرکردندا .
٤- توانای مامۆستا لە ڕێکخستنی چالاکییە گونجاوەکانی ناو پۆل و دەرەوەی پۆلدا بۆ قوتابییەکانی .
٥- توانای زمانەوانی مامۆستا و بەکارهێنانی بەشێوەیەکی ڕاست و ڕەوان
٦- توانای مامۆستا لە دانانی تاقیکردنەوە بۆ پێوانەی ئاستی فێربوونی قوتابییان.
٧- توانای مامۆستا لە شرۆڤە کردنی ئەنجامی تاقیکردنەوەکان .
٨- توانای مامۆستا لە پرسییارکردنی ناو پۆلدا .
٩- توانای مامۆستا لەبەرهەمهێنانی ئەو هۆی فێرکردنانەی پێویستی پێیانە .
١٠- توانای مامۆستا لە بەکارهێنانی کتێبەکانی قوتابخانە بە شێوەیەکی کاریگەر.
١١- توانای مامۆستا لە دەوڵەمەندکردنی پرۆگرامەکانی قوتابخانەدا .
١٢- توانای درێژەدانێکی ئەزمونیانەی مامۆستا لەگەڵ ئەوانەی لە پرۆسەی هەڵسووڕاندنی پەروەردەییدا کاریان لەگەڵدا دەکا ،لە پێناو بەرەوپێشبردنی کارامەییە فێرکردنەکاندا .

**دووهەم/ ڕۆڵی بەڕێوەبەری قوتابخانە لە چاك جێبەجێ كردنی پرۆگرامەكانی قوتابخانەدا :**

پرۆگرام چوار توخمی بنەڕەتی دەگرێتەوە كە ئەمانەن : ئامانجەكان — ناوەرۆك — شارەزاییيەكان — راستكردنەوە و هەڵسەنگاندن . كەواتە ئەو لایەنانەی دەكەونە ناو گرینگی پێدانی بەڕێوەبەری قوتابخانەوە كە پەیوەندییان بە پرۆگرامەكانەوە هەیە ئەمانەن :

١- دەوڵەمەند كردنی وانە زانستییەكان .

٢- بەكارهێنانی كتێبی خوێندنی قوتابخانە .

٣- بەكارهێنانی هۆیەكانی فێركردن .

٤- هەبوونی هۆیەكانی فێركردن بەزۆری.

٥- دەكار خستنی ئێستگەی قوتابخانە .

٦- بەكارهێنانی كتێبخانەی قوتابخانە.

٧- ئەنجامدانی چالاكییەكانی ناوەوە و دەرەوەی پۆل .

٨- بەكارهێنانی تاقیگای قوتابخانە .

٩- گەشتەكانی قوتابخانە .

١٠- ئەزمونی دیاریكردنەكان .

١١- ئەزمونی فێربوونەكان .

١٢- پێوانی فێربوونی قوتابییان و هەڵسەنگاندنیان .

**سێهەم / ڕۆڵی بەڕێوەبەری قوتابخانە لە چاودێری قوتابییاندا :**

١- جێبەجی کردنی پلانــە ئاراســتەییە دانراوەکــان بــۆ وریــا کردنــەوەی قوتابییــان دەربارەی سیستەمی قوتابخانە و بنجینــەکانی دەرچــوون و مانــەوە و ئــەرك و مــافی قوتابی .

٢- ڕەخساندنی بارو دۆخێکی گونجاو تا قوتابی مافی خۆی دەستکەوێ لە خوێندندا.

٣- دانانی سیستەمێك بۆ تۆمارکردن و کۆکردنەوە زانیارییــە کەڵەکــە بووەکــان بــۆ ئاراستە کردنــی قوتــابی بەشــێوەیەکی کاریگەریانــە بــەرەو دۆزینــەوەی هێــزو وزەو تواناکان لە قوتابیدا .

٤- یارمەتیدانی دەستەی مامۆستایان لە ڕێك خســتنی زنجیرەبەندییــەکانی بەرنامــە ئاراستەیی ورێنمایی کردنەکان .

٥- کارکردن بۆ پتەوکردنی پەیوەندییەکانی نێوان مامۆستایان و قوتابییان .

٦- دانـــانی سیســـتەمێکی ڕوون و دیـــاریکراو بـــۆ لێپرســـینەوەی قوتابییـــان و ئاگادارکردنەوەی پێش وەختەی قوتابیانیش لەوسیستەمە .

٧- ڕووبەڕووبوونەوەی گیروگرفتە تایبەتییەدەروونییەکانی قوتابییان کە بەسیستەمی قوتابخانەوە بەندە .

٨- گونجاندنی چالاکییەکانی قوتابییان کە بەخزمەتی کۆمەڵگا خۆجێیەکەوە بەندە .

٩- هاوبەشــی قوتابییــان لــە بــەڕێوەبردنی دەوامــی ڕۆژانــەی قوتابخانــە لــە ڕێــی مەشقکردنیانەوە بۆ بەرزەفت کردنی ڕێکــوپێکی و هــەروەها هاوبەشــی کردنیــان لــە هەڵسوراندنی هەندێ کاروباری بەڕێوەبردندا .

## چوارەم/ ڕۆلی بەڕێوەبەری قوتابخانە لە ناساندنی ژینگەی خوجێیدا :

ئەمە بە یەکێك لەو ڕۆڵە جیاوازوگرینگانە دادەنرێ کە جیاوازی تاکەکان لە نێوان ڕەفتارەکارگێرییەکانی ئەو قوتابخانەو یەکێکی تردا دەردەخات ، بەرێوەبەری قوتابخانە دەبێ لە دۆزینەوەی پەیوەندییە پتەوەکانی نێوان قوتابخانەکەی و ژینگەی دەوروبەریدا زۆر کارامەو سەرکەوتووبێت و تا دەشتوانێ سوود لەو پەیوەندییانە وەربگرێت بۆ خزمەتی کاروبارەکانی بەڕێوەبردنێ .
بەرێوەبەری وریای قوتابخانە ئەوەیە کە پلانی ئامانج ڕوون و ئاشکرا دادەنێ و ڕێگاکان دیاری دەکا بۆ سوود وەرگرتن لە ژینگەی خۆجێی بە گوێرەی گەشەی کۆمەڵگا ، نەك هەروا لە خۆوە بە گوێرەی رێکەوت هەنگاوبنێ .
هەندێ ڕێگا کە لەوانەیە بەڕێوەبەری قوتابخانە لە بواری کاروبارو ڕێکخستنی قوتابخانەدا بیانگرێتەبەر :

## یەکەم لە بواری بەڕێوەبردنی قوتابخانەدا :-

١- شێوازی هاوبەشیکردنی کارمەندەکان .
٢- دەرکردنی فەرمانەکان بێ پرسی کارمەندەکان.
٣- بە یەك چاو سەیرکردنی هەموو کارمەندەکان .
٤- دابەشکردنی بەرپرسایەتی لەبەر ڕۆشنایی پسپۆڕی هەریەك لە مامۆستاکان .
٥- توندی و نەرموشلی نواندن پێکەوە .
٦- پێکەوە لکاندنی هەندێ جۆرەکار لەگەڵ جارانی پێشووتر .

## دووەم لە بواری لایەنی بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی کردندا :

١- پێداگرتن لەسەر لایەنەکانی بەڕێوەبردن لە هەڵسوڕاندن و ڕێکخستنی قوتابخانەدا.
٢- تەرخانکردنی کاتی تەواو و گرینگییەکەی لە کاروباری نووسیندا .
٣- پێداگرتن لەسەر لایەنەکانی سەرپەرشتیکردن .
٤- تەرخانکردنی کاتی تەواو و گرینگییەکەی بۆ قوتابییان و دەستەی مامۆستایان و کۆمەڵگای خۆجێی .
٥- گونجاندنی لایەنەکانی بەڕێوەبردن و سەرپەرشتیکردن .
٦- پێکەوە لکاندنی هەندێ جۆرەکار لەگەڵ جارانی پێشووتر .

## سێهەم لە بواری ڕێکخستنی قوتابخانەدا :

١- نەرمی نواندنێکی تەواو .
٢- پێداگری لەسەر وانەکان ( ماددەکان ) ی خوێندن .
٣- پێداگری لەسەر چالاکییەکانی قوتابخانە .
٤- خۆ فێرکردنی خودی لەناو پۆل و دەرەوەیدا .
٥- گەشەی فەرمانبەرداری کارمەندان .
٦- هاندانی گیانی کارکردنی پێکەوە ( یەك تیمی )
٧-لکاندنی هەندێ جۆرەکاری پێشتر .

## چوارەم لە بواری بڕیاردان :

١- دەبێ بڕیارەکە تاکە کەسی بێ .
٢- هاوبەشی هەندێکان لەو بڕیارانەی پەیوەندییان بە کاروبارەکانی قوتابخانەوەیە .
٣- ڕێ پێدانی قوتابییان بۆ هاوبەشیکردنیان لە بڕیارداندا .
٤- بڕیاردان ... لەبەردەمی هەموو ئەوانەی بڕیارەکە دەیانگریتەوە .
٥- سەردانی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە دوای دەرکردنی بڕیارەکان .

## پێنجەم لە بواری کاریگەری و توانایەکان :

١- هەوڵدان بۆ هێنانەدی ئامانجە پەروەردەیی و فێرکاریەکانی قوتابخانە .
٢- هەوڵدان بۆ هێنانەدی حەز و ئارەزووی کارمەندەکان .
٣- لەبەرچاو گرتنی بارودۆخەکانی دەوروبەر کە پەیوەندیان بە وەرگرتنی بڕیارەکانەوەیە .
٤- هەوڵدان بۆ هێنانەدی هاوکێشە و کامڵبوونی نێوان پەیوەندییە مرۆییەکان و کارکردنی کارمەندان و هەلوەستە لەسەر ئەنجامدانی کارەکان .
٥- سەرەدەرلێکردنی پڕۆگرامەکانی خوێندنی هەموو قۆناغەکان.
٦- تێگەیشتنی لایەنەکانی بەڕێوەبردن و دارایی و سەرپەرشتیکردنی هەرچی پەیوەندی بە قوتابخانەوەیە .

### هەندێ لەو بناغانەی کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی لەسەر دیار دەکرێ

١- دەبێ دیاریکردنی بەڕێوەبەری قوتابخانە لەو مامۆستایانەبێ کە بەهرەدارن و توانای ڕاگرتنی ئەو بارە قورسەی ئەو سەرکردایەتییەی هەبێ ، دەبێ ئەوەشمان لەبەر چاوبێ مەرج نیە هەموو مامۆستایەکی سەرکەوتوو بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتووی لێ دەرچێ .

٢- دەبێ لە ئاستی توانایەکی لێوەشاوەو ناوازەو کەسایەتییەکی بەهێزی هەبێ .

٣- دەبێ دەستخۆشانەی زۆر زۆرباشە و سەرووتری دوو سالانی لە سێ سالی کارەکەیدا وەدەست هێنابێ .

٤- بەلانی کەمەوە دەبێ دووسالی لەو ئەرکەی دواییەی بەسەر بردبێت .

٥- دەبێ تاقیکردنەوەیەکی سەرکاغەزی بڕیبێ و لە لایەن لێژنەیەکی پسپۆریشەوە ئەنجامدرابێ . ♣

---

♣سەرچاوە:لە Googleکراوە بەکوردی

پێنج شەممە ٢٠١٢/١١/٢٩ ژمارە (٤٢٠٥) لە رۆژنامەی خەباتدا بلاوکراوەتەوە.

# لاكرنەوەيەك لە كۆبوونەوەكانی ماڵ و قوتابخانە يان دايك و باوك و مامۆستايان

**ن/ شوارێ**

هەر لە دەسپێكی ئەم نووسینەمدا، پێم خۆشە ئەوە بە خوێنەری ئازیز بڵێم، كە نامەوێ بە دیباجە و پێشەكییەكی ئەدەبیانە بچمە ناو دنیای ئەم بابەتە پەروەردەیییەی بەردەستتان، تا بیرو هزرو خەیاڵی ئاسوودەتان ماندوو نەكەم و بۆ خۆشم لا ڕێ نەبم و نەكەومە هەڵەت و پەڵەتان.

هەر لەناونیشانی بابەتەكەوە دیارە مەبەست بەرەو چ هەوارێكە ... هەر یەكێك لە ئێمە یا زۆربەمان، بەتایبەتی ئەوانەی منداڵی قوتابخانە (قوتابی) مان هەیە، دەزانین كە ساڵانە دووجار لەسەرەتای وەرزی كرانەوەی دەرگای قوتابخانەكانی دوای پشووی هاوین و بەرە بەری كۆتایی وەرزی تەواوبوونی ساڵی خوێندن (كۆبوونەوەی مامۆستاو دایك و باوكان) یان بڵێین (كۆبوونەوەی قوتابخانە و ماڵی قوتابییان) یا هەر ناوێكی

دیکەی بۆ ئـەم مەبەسـتە لیٚ بنـریٚ ... دەگـیریٚ، کـە دیـارە ئـەو کـۆڕو کۆمەڵـەو کۆبوونەوانەش ئامانج و مەبەستێکی زۆریان لـە دواوەیـە، کـە دەکـریٚ هەنـدێکیان بخەینە بەرچاوی خوێنەر و هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان هەر لەکەسی خوارەوەڕا تـا دەگاتە ترۆپکی بەرپرسایەتی:

١- بۆ ناساندنی کەسوکاری قوتابی بە مامۆستایان و بەڕێوەبەر و بەردەست و کـەش وهەوای قوتابخانە .

٢- هاندانی کەسوکاری قوتابییان و تێگەیاندنیان، کـە قوتابخانـە بـە مـاڵی دووەم و مامۆستاو بەرێوەبەرو کارمەندەکانیش بە کەس وکارو دڵسۆزی منداڵەکانیان بزانن .

٣- زانیاری گۆڕینەوە دەربارەی هەڵس و کەوت و رەفتاری قوتابییان بەیەکتر لەلایەن دایکان و باوکان و قوتابخانەوە ، بۆ ئەوەی چ لە ماڵەوە و چ لە قوتابخانەدا ئاگـاداری خوێندن و کاروکردەوەکانیان بن و ماڵەوە و قوتابخانە یەکتریان لیٚ — لە قوتابییـەکان ئاگاداربکەنەوە.

٤- بۆ نزیك خستنەوەو یەك خستنی شێوازی پـەروەردەی منداڵـەکان لـە قوتابخانـەو ماڵەوەدا، تا منداڵەکان تووشی دووفاقی پەروەردە نەبن و کاری فێرکردنیشیان ساناتر بێت ..

٥- بۆ بەرزکردنەوەی لایەنی شانازی و بە خۆنازینی قوتابی و هەست کردنی بەگرنگی پێدانی لەلایەن دایـك و باوکیـەوە، بەتایبـەتی کـە دەبیـنن کەسـانێك هەیـە لێیـان دەپرسێتەوە و چاوەدێری و سەرپەرشتیان دەکا ... هتد .

ئەمانەو زۆرشتی تریش کە پێویست ناکا بیکەینە ئەو چیرۆکەی کۆتایی نایە. ئەوەی لێرەدا دەمانهەویٚ بیخەینە بەرچاو و شەن وکەوێکی ورد و درشتی بکەین، چـۆنیەتی ئەنجامدانی ئەو کۆبوونەوانەیە — کۆبوونەوەی دایك و باوك و مامۆسـتایان — سـاڵی

دوو جار له قوتابخانەکانی لای خۆماندا و شێواز و شێوەی بەڕێوە چوونی و بەرەنجام و دەرەنجامەکانی بخەینە بەرچاو، هەروەك نموونەی جیاوازیش دەگەڵ شێوە و شێوازی ئەو جۆرە کۆبوونەوانەی ولاّتانی خواپێداو و پێش کەوتوودا بخەینە روو، نەك بە مەبەستی بەراوردکردن بەڵکە بۆ وەبەرچاوخستنی شێوەو شێواز و جیاوازییەکانی ئەو دوولایەنەی ئەم چالاکییە.

پێم خۆشە وەك مامۆستایەك و بەرێوەبەرێکی پێشووی چەندین قوتابخانەی هەمە جۆر و جیاواز، شێوەو شێوازی ئەو کۆبوونەوانەی قوتابخانەکانی لای خۆمان بخەمە سەر سفرەی چاوەروانیە بیسمیللایە :

جارێ لە بەراییەوە دەبێ ئەوە بڵێم کە زۆربەی زۆری کۆبوونەوەکان و بەردەوامیش هەر دایکان بەرێژەیەکی زۆر و بەرچاو و کەمێکی کەمیش لە باوکان یا برا، یا خوشکی قوتابیش جاری واهەیە لە جیاتی دایك و باوکەکان ئامادە دەبن. زۆر زۆر بە دەگمەن رێك کەوتووە دایك و باوکێکی قوتابییان پێکەوەهاتبن بۆ کۆبوونەوەی ماڵ و قوتابخانە یا دایك و باوك و مامۆستایان. بە هەر حاڵ بابچینە سەر شێوەو شێوازی ئەنجامدان و بەڕێوەچوون و کۆتایی ئەم چالاکییە، لە قوتابخانەکانی لای خۆماندا :

رۆژێك یان چەند رۆژێك پێشتر بەڕێوەبەر بە رابەری هەموو پۆلەکان دەڵێ کە قوتابییان ئاگادار بکەنەوە، رۆژی ... بەرواری ... پێش نیوەڕۆ یان دوای نیوەڕۆ (ئەگەر قوتابخانەکە دوو دەوام بێت) بە دایك و باوکانیان بڵێن لە قوتابخانە ئامادەبن کۆبوونەوەی دایك و باوك و مامۆستایانە و لەو دەوامەشدا قوتابییانی تێدا نایەنەوە قوتابخانە ...

جا هەرکە ئەو رۆژ و بەرواری کۆبوونەوەیە هات، ئیدی ژن و ژاڵی گەڕەکێ، دوو دوو و سێ سێ ئی واش هەیە منداڵیشی نیە هەر ڕەگەڵ دەکەوێ و دێ بزانێ چ باسە .

لە سەرەتادا بەرێوەبەری قوتابخانە لەگـەڵ مامۆسـتایاندا پێشـوازییەکی هەرەمـەکی نارێك لە کەس و کاری قوتابییان دەکەن و مامۆسـتایەك و یاریـدەدەر و بەڕێوەبـەری قوتابخانە دەچنە ئەو جێیەی کە پێشتر لە حەساریّ یا لە هۆڵی قوتابخانەدا .— ئەگـەر هـۆڵ هـەبێ - لەسـەر کورسـی و لەبـەردەم مێزێکـی پـان و پـۆڕدا دادەنیشـن و مامۆستاکانی دیش یان بە پێوە یان لـە تەنیشـت ئەوانـەوە دانیشـتوون و چـاوەڕێی فەرمایشاتن.

دیـارە لـەم کۆبوونەوانەشـدا جاروبـارە سەرپەرشـتیارێکی پـەروەردەی قوتابخانەکـە ئامادەبووە — بـۆ خـۆم شـایەتحاڵم زۆر کۆبوونـەوە بـێ سەرپەرشـتیاری پـەروەردەی قوتابخانەکراوە— ئەوجا دوای بەخێرهێنان و — دانیشتنی کەسوکاری قوتابییان، وتاری بەرێوەبەری قوتابخانە دەست پێدەکات، کە هەر تەنیا — وەك رۆتینێك — باری سەرنج و تێبینـی و بابەتـە گشـتییەکان، وەك ئاسـتی زانسـتی قوتابییـان بەگشـتی و پەیوەندییەکانی نێوان مامۆستاو قوتابییان، قوتابی و پاکو خاوێنی و هەڵس و کەوت و رەفتاری قوتابییان و چاودێری کردنیان، شێوەی رەفتاری مامۆستایان و بە دەنگەوە چوونیان لە هەر کاتێکی قوتابی پێویستی پێی بێ .. فلانی وای شەنەبا دەکـا تـەپو تۆزی لە دووری فرسەخێکەوە دیاربێ و لە دەشتی پـەروەردەو فێرکردنێـدا سـێوەڕەی دێنێتە ئەژنۆیان .. هەرکە بەرێوەبەریش لێ بۆوە ئیدی ئەوە یاریدەدەرەکەی هەر بـەو پێودانگە ئـەو کـەلێن و کەلەبەرانـە دەگـرێ کـە لەقسـەو وتارەکـەی بەڕێوەبەریـدا بەجێمابوون و بەسەریدا باز دابوون.

ئەوجا کارتی نمرەی قوتابییانی ئەم وەرزەی کۆبوونەوەکـەی تیـدا دەکـرێ، کەپێشـتر ئامادەو تەواو کراوە. ئیدی ئەوە دەبێتە دوایین پێوەری قوتابی و مایەی سـەربەرزی و یان مل کەچی و شکاندنەوەی کەسـوکاری قوتابییـان ... چـونکە بەڕێوەبـەر دەسـت

دەکات بە خوێندنەوەی ناوی قوتابییان ... لەگەڵ خوێندنەوەی ناوی هەر قوتابییەکیش دەپرسێ کێ باوکی ئەو قوتابییەیە، کە باوکەکەش یا دایکی گوێی لە داوای بەڕێوەبەر بوو، بە ناچاری و دڵە ڕاوکێوە دەست هەڵدەبڕێ، ئەوجا بەڕێوەبەر دوور لە هەموو پێوەرێکی پەروەردەیی و لەبەر چاوی ئەو حەشیمەتە منداڵەکە و باوك یا دایکی منداڵەکە — ئەگەر دەرنەچووبێ — دەشکێنێتەوە و دەستدەکا بە ئامۆژگاری باوك یا دایکەکە، ناوی قوتابییەکی زیرەکیشی بەنموونە بەڕوو دادەداتەوە و دەکەوێتە پێدا هەڵدانی کەسوکاری قوتابییە زیرەکەکە، دەوجا وەرە ئەوە چەندی بە چەندی !؟ ئەو دایك یا ئەو باوکە دەو دەمیدا دەکەونە بارێکی دەروونی ئەو تۆوە کە نەك هەر نەفرەت لە قوتابخانەو فێربوون و پەروەردە، بێزیان لە منداڵەکەشیان و لە هەرچی مامۆستاو دامودەزگای پەروەردەشە دەبێتەوە. سەیرەکەش لە وەدایە، تا دەگاتە دوایین قوتابی ئاوا کارتەکان دەدرێتەوە .. کە ئەم بەشەی کۆبوونەوەکە تەواوبوو، ئینجا دەستدەکەن بە هەڵبژاردنی سەرۆکی ئەنجوومەنی دایکان و باوکان، کە ئەمەش هەر شتێکی رووالەتیەو هیچی دی و لەتێکڕای قوتابخانەکانیشدا هەر بەو جۆرەیە. دوای دەستنیشان کردنێ باوکێك بە سەرۆکی ئەنجوومەن تابێتە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان دایکان و باوکان لەلایەك و مامۆستا و قوتابخانە لەلایەکی تر.

ئەوجا دەبێتە هات و باتی چوکولیات و شیرینی بەشینەوە بەسەر ئامادەبوواندا، خۆ ئەگەر بەڕێوەبەرێك یا مامۆستایانی قوتابخانەیەك — بەدەگمەن — تەزووی جووڵەیەکیان تێدابێ، ئەوا سروودێك ، چەند گۆرانیەك، یا تابلۆی هەڵپەرکێیەك پێش وەخت ئامادە دەکەن و قوتابییان پێشکەشی دەکەن ... دەنا لەوە بترازێ ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ .

شتێکی لە هەمووی سەیرتر کە لە پەراوێزی ئەم جۆرەکۆبوونەوانەدا گوێ بیست دەبین و ئەنجام دەدرێن، ئەوەیە، کە دایکێك یا چەند دایکێك هەواڵی منداڵەکەیانیان لە مامۆستای وانەکانی پرسیوە، زۆر بەناز و خۆبادانێکەوە — کە زۆرجار بۆ خۆم ئاگام لێبووە - بە دایکەکەی گوتووە ، منداڵەکەت زۆر تەمبەڵە و هیچ نازانێ، دەبێ لە ماڵەوە سەعی پێ بکەن و هەوڵی لەگەڵ بدەن فێری کەن، زۆریش پیس و پۆخڵ و چڵکنە سەری پڕ لە ڕشك و ئەسپێیە و ئەوانیدیشی ئەسپێاوی کردووە، جا وەرە ژنەکە لەناو ئەو حەشیمەتەی گوێت لەو قسە پەروەردەییانەی مامۆستای ئاوا بێ جا کاتێ کە بەڕێوەبەر کۆتایی بە کۆبوونەوەکە هێنا بەر لەوەی بڵاوەبکەن داوا لە کەسوکاری قوتابییان دەکا بەردەوام هاوکاری قوتابخانە و مامۆستایان بکەن و سەردانیان بکەن و لە گیرو گرفتی منداڵەکانیان لە ماڵەوە ئاگاداریان بکەنەوە، تا بەکۆمەکی هەردوو لا بتوانن ئاستی زانستی و خوو و خدەو رەوشتیان بەرزکەنەوە و بتوانن بیانکەنە مرۆڤێکی بەکەڵکی دوارۆژ ... کە بە داخەوە ئەم هەموو قسانە هەر دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەکە دەبنە بلْقی سەر ئاو .

جالێرەوە هەر بۆ بەرجەستەکردنی جیاوازیی کۆبوونەوەکانی ماڵ و قوتابخانە، لە نێوان ئەوەی ئێمەو ئەوەی لە وڵاتانی خوا پێداو وپێشکەوتوودا هەیە، دەمانەوێ هەروەك کورتە باسێکیش بێ بەبێ ناو هێنانی هیچ ولاتێك هەندێ لایەنی کۆبوونەوەکانی ماڵ و قوتابخانەی هەندەران، بخەینە بەر دیدی خوێنەران بەگشتی و بەردەمی مامۆستایان و بەڕێوەبەرو سەرپەرشتیاران و پەیوەندیدارانی لای خۆمان، بەڵکە ئێ ئەوە خوایە وردە دەمارێکی بەزەیی هاتنەوە بەخۆماندا بجوولێ و ئێمەش ئەگەر وەك چاولێکەری و لاسایی کردنەوەش بێ، شتێك فێربین و دڵسۆزانە بەرەوپیری تێکڕایی گۆڕانکارییە

بنەڕەتییەکان بچین ... خۆ ئێمەش هیچمان لە کەس کەمترنیە بیرکردنــەوەی چــاك و ئیش کردنی دڵسۆزانە نەبێ .

ڕەنگە ئەو پەیوەندییەی نێوان ماڵ و قوتابخانە کە ئێمە ناومــان نــاوە (کۆبوونــەوەی دایك وباوك و مامۆستایان) لە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکان — لەگــەڵ سیســتەمی جیاوازی پەروەردەو فێرکردنیان — زیاتر ستایلێکی بانگ هێشــتن و داوەتانــەی پێــوە دیاربێ ، چونکە هەموو کۆبوونەوەکانییان دەستەجەمعی نین، بەڵکە بەشــێوەی تاکــە خێزانی کە بریتییە لە دایك و باوکی قوتابی دەبینرێن و گفتوگــۆ دەکــەن و هــەرگێرو گرفتێکیان لەلایەنی منداڵەکەوە هاتبێتە پێش، جا چ لە ماڵەوەبێ یــا لــە قوتابخانــە ئەوە هەردوولا دادەنیشن و گێرو گرفتەکان تاوتوێ دەکەن و دەگەنە ئەو ســەرەنجامەی کە دەیانهەوێ .. ستایلی ئەو بانگ هێشتنە یا ئەو چاو پێکەوتنە یا ئەو کۆبوونەوەیە بەم شێوەیە دەکەن کە :

سەرەتا کات و شوێن و ڕۆژ بۆ هەر خێزانێك — دایــك و بــاوك -ی هــەر قوتابییــەك دیاری دەکرێت و بەکارتێکی داوەتنامە ئاگادار دەکرێنەوە، کــە ئەمــەی خــوارەوەش نموونەی یەکێك لەو کارتی بانگ هێشتنانەیە :

( ئەگەر حەز دەکەن ئاستی کوڕ یا کچەکانتان بە شێوەیەکی گشتی لــە قوتابخانــە دا بزانن و لەم بارەیەشەوە بتانەوێ گوێ لە ڕاو بۆ چوون و تیبینیــەکانی ئێمــە ڕاگــرن ، تکا دەکەین لە کاتژمێر ... .... ی ئێوارەی ئەمڕۆی ڕۆژی ... ئامادەبن . )

ئینجا هەر بــەم جــۆرە کــارتی جیاجیــا بــۆ چــەندین خێزانــی دیکــەش دەنێــردرێ و هەریەکەیان لەکات و ساتی دیاریکراوی خۆیاندا چاو پێکەوتنیان لەگەڵــدا دەکرێــت. ئەوەی جێی سەرنجیشە دەبێ دایك و باب پێکەوە هەردووکیان لەو چاو پێکەوتنانــەدا ئامادەبن و هەرگیز یەکێکیان بــە تــەنیا قبــوڵ نــاکرێ ، لایــەنێکی پــۆزەتیڤی ئــەو

کۆبوونەوانەش ئەوەیە کە هیچ خێزانێك ئاگای لە کۆبوونەوە و گفتوگـۆ وگیروگرفتـی منداڵی خێزانێکی دیکە نیە.

جگە لەو کۆبوونەوەیەی کە باسمان کـرد، چـەند کۆبوونەوەیـەکی دیکـەش هـەن کـە هەریەکەیان ئامانج و مەبەستێکی تایبـەتی خۆیانیـان هەیـە، هەمووشـی هـەر بـە سوودی پرۆسە پەروەردەیی و فێرکردنەکە تەواو دەبێت و، وەك بنەمایەك فەلسەفەی پەروەردەی دەوڵەت یەك دەخات ... نموونەی ئەو کۆبوونەوانەش ئەمانەی خوارەوەن :

١- کۆبوونەوەی دەستپێکی سەری ساڵی تازەی خوێندن کە پێـی دەڵـێن (کۆبوونـەوە یان ئاهەنگی یەکتر ناسین) کە هەر لە ناوەکەیەوە ئامانج و مەبەسـتەکەی دیـارە ... لەسەرەتای هەموو ساڵێکدا ئـەم کۆبوونەوانـە بـۆ یـەکتر ناسـینی دایـك و باوکـانی قوتابییـان لەلایـەن قوتابخانـەوە رێـك دەخـرێ، تـەنیا و تـەنیا هـەر بـۆ مەبەسـتی یەکترناسینی دایك وباوکانی قوتابییەکان لە ناوخۆیاندا، کە لەو دیدارەشـدا هـەرگیز باس لە هیچ گیرو گرفت و تێگیراوی و تەنگوچەڵەمەیەکی ناوەوە و دەرەوەی قوتابخانە و قوتابی ناکرێ، تەنیا بۆ بەسەر بردنی کات و ساتێکی ئارام و قسەی خۆش و چاك و چۆنی و هەواڵی یەکتر پرسین و تۆخـۆش و مـن خۆشـییە. ئـەوەی جێـی سەرنجیشـە قوتابییان خۆیان تەوەری سەرەکی راپەراندنی ئەرکەکانی ئەم کۆبوونەوەیەن، هـەر لـە پێشوازی کردن و ئاو و شیرینی گێران و بەخێرهێنان و بەرێ کردنەوەی میوانەکانـدا، ئەمە جگە لەوەش کە قوتابییەکان بە یارمەتی و کۆمەکی مامۆستایان ئەو ئەرکانـە بە کۆتا دێنن. گرنگی ئەم کۆبوونەوانەش جگە لەیەکتر ناسین و پێکتر ئاشنا بـوونیش دایك و باوکی قوتابی دڵنیا دەکاتەوە لە منداڵەکـەی کـە هاوبەشـی راسـتەوخۆ لـە چالاکییەکانی قوتابخانەدا دەکات .

٢- کۆبوونەوەو دیدارێکی دیکەشیان هەیە کە بریتییە لەوەی خوارەوە :

کاتێ کە قوتابخانــە ســات و کــاتی ڕۆژی کۆبوونــەوە دیــاری دەکــات و کەســوکاری قوتابییان ئاگاداردەکرێنەوەو ئەوانیش بەدەنگ داوای قوتابخانەوە دێن ، بەڕێوەبــەری قوتابخانە قسەی خۆی دەکات و مەبەستی بانگهێشتنەکە روون دەکاتەوە ، ئەو ئــاو و شیرینی و ساردەمەنیانە دابەش دەکرێن و پشوویەك دەدەن . ئــەوجا دایــك و بــاوکی قوتابییان دەبەنە ئەو پۆلانەی کە منداڵەکانیانی لێیە ، و زۆر شتی گرنگییــان پــێش چاو دەکەوێ کە دڵیان پێی خۆش دەبێ وەك ئەوەی کە : ڕابەری پەروەردەیی بەتەنیا و بێ بەڕێوەبەر و مامۆستایان . دەوکاتەیدا قوتابییەکان بە هێمنی و ئارامییــەکی بــێ ژاوە ژاو هەڵدەستن و بەناو یەکەیەکەی هــەموو دایــك و باوکەکانــدا دەســووڕێنەوە و دەگەڕێن و خۆیان بە دایك و باوکــەکانی تــر دەناســێنن . و ئــەو بابــەت و باســانەی خوێندووشیانە هەمووی بە دایك و باوکــەکان دەڵــێن و چــالاکییەکانی نواندووشــیانە ئەوانیشیان دەخەنە بەرچاو و لێیــان ئاگــادار دەکەنــەوە و هــەموو ئــەو بەربەســت و گیروگرفتانەی کە هاتۆتە بەردەمیشیان و چۆناو چۆنیان روو بەروو بوونەتەوە و چۆنیان چارەسەر بۆ دۆزیونەوەو نەیانهێشتوون ئەمانەشیان هەموو لــەلا یــەکالا دەکەنــەوە و ئەوەشیان بۆ ئاماژە دەکەن کە هەریەکە یان دەیهەوێ چۆناو چۆن و بە چ ڕێگایــەك ئەو بەربەست و گیروگرفتانەیان لادەن و چارەسەریان بکەن و نەیانهێڵن .

دوابە دوای هەموو ئەم شتانە دەســتدەکەن بــە دابەشــکردنی فــۆرمی تایبــەت بــەم کۆبوونەوەیە بەسەر دایك و باوکاندا بۆ ئەوەی ئەوانیش باری سەرنج و تێ بینی و ڕاو بۆ چوونی خۆیان و پێشنیارەکانیانی تێدا تۆماربکەن .

جاوەك دەڵێن : مشتێك نموونەی خەروارێکە، لێرەدا لە هێنانەوەی چەندین و چــەندان جۆر و ستایلی کۆبوونەوەی دیش کە هەن مرۆڤ لە چاو ئەوانــەی خۆمانــدا ســەری لێ سوڕ دەمێنێ ... بەڵام ئەوەی سەرەنجامی ئەم بابەتە دەیخاتە بەرچاو تەنیا هــەر ئــەو

جیاوازییانەی ئێمە و هەندەرانە لە پراكتیزە كردنی ئەم جۆرە كۆبوونەوانــەو رەنــگ و رواژاو دیموكراتیزە كردنی كۆبوونەوەكانی هەنــدەران و كرانەوەیانــە بــە رووی دایــك و باوك و قوتابی و قوتابخانەدا و ئاشكراكردنی داخراوی و بێ دەرەنجامی و سەرەنجامی كۆبوونەوەكانی لای خۆمانە ...

خۆزیا ئێمــەش وەك میللــەتانی پێشــكەوتووی دنیایــە بــە زوویــەكی زوو دەهاتینــە ریزێ. ♥

---

♥تێبینی/ نموونەی ئەو دوو كۆبوونەوانەی هەندەرانیش ولاتی هۆڵەندەیە .

سەرچاوەكان /

١- مدارسنا و مدارسهم وسبل الاستفادة من تجاربهم ( دراسة موضوعية- تحليلية - مقارنـة ) رشيد كريم خان عقراوی / ٢٠٠٨ دهوك

٢- المنهج بين النظرية و التطبيق / د . راتب قاسم عاشور / ٢٠٠٤ - عمان

٣- ئەزموونی گەلان لە بواری پەروەردەو فێركردن / ئەحمەد قرنی / ٢٠٠٣ - هەولێر

٤- پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵ/ نووسینی - مكارنكو / وەرگێرانـی :- مسـتەفا غـەفور / ٢٠٠٦ - هەولێر

٥- چەندین بابەتی هەمەجۆری پەروەردەیی لە رۆژنامەی خەباتی بەرێزدا . بە دووبـەش لـە رۆژنامەی خەبات دا بڵاوكراوەتەوە

- ژمارە (٣١٧٤) بەرواری ٢٠٠٩/٥/١٧

- ژمارە (٣١٧٨) بەرواری ٢٠٠٩/٥/٢١

# چۆنیەتی ڕێکخستنی خشتەی وانەکانی هەفتە لەناو قوتابخانەدا

**ن/ شواریێ**

بێگومـان بـەر لەهـەموو شـتێ دانـانی خشـتەی وانـەکان تەوەرەیەکـە بـۆ هـەموو چالاکییەکان و ئیشو کارەکانی ناو قوتابخانە. هەموو ئەندامانی ناو قوتابخانە لەدەوری دەخولێنەوە. خشتەی وانەکانی هەفتە ڕێـك خشـتەیەکە بـۆ کردارەکـانی پـەروەردەو فێرکردن کە بەو هۆیەوە هەر مامۆستایەك و قوتابییەك ئەو کارەی پێ ڕاسـپێردراوە، دەیزانێ، واتە کورتەیەکە لەئیش و کارەکان و چـالاکییەکانی قوتابخانـەو گونجانیشـە بەشێوەیەکی چـاك بـۆ جێبـەجێکردنی ئامانجـەکانی پرۆسـەی فێربـوون و فێرکردنـی پەروەردەیی.

جا بۆیە پێش ئامادەکردنی خشتەی وانەکان پێویستە بەڕێوەبەری هـەر قوتابخانەیـەك لەگەڵ مامۆسـتاکانی کۆببێتـەوە بـۆ دابەشـکردنی چـالاکییەکان و وانـەکان بەسـەر ئەندامانی ناو قوتابخانەو هەر کەسەو بەگوێرەی پسـپۆری و توانـای خـۆی وانـەکانی بەسەردا دابەش بکات.

لێرەدا پێویستە بەڕێوەبەر ڕەچاوی سیستەمی قوتابخانەی بنەڕەتییـەکان بکـات، بـۆ بەشی هەریەکە لەمامۆستایان و یاریدەدەر و بەڕێوەبەر بـۆ وانـەکان. پێویسـتە بـەر لەدانانی خشـتەی وانـەکان ڕای مامۆسـتایانی وەربگـرێ و ئاگـاداری مامۆسـتایان

بکاتەوە پـێش بـەکارهێنانی، بـۆ ئـەوەی داخـوازی و ئارەزووەکـانی مامۆسـتایانی جێبەجێ بکات و هەریەکە بە پێی پسپۆری و شارەزایی خۆی، نـەك بـۆ مامۆسـتای وانەی هونەری، وانەی ئینگلیزی بۆ دابنێ، ئەم ڕەفتارە بـە حەقیقـەت دەبێتـە هـۆی دواکەوتنی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن. بە مـەرجێکیش جێبـەجێکردنی ئـارەزووی مامۆستایان نەبێتە هۆی پێشێلکردنی مافەکانی قوتابییان. دانانی خشتەی وانـەکان پێویستی بە شارەزایی و بەهرەیـەکی تایبـەتی هەیـە. هـەروەها دانـانی خشـتە لـە قوتابخانەیەکەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر دەگۆڕێت، بە تایبـەتی لـەو قوتابخانـەی کـەمی میلاکی مامۆستاو ژمارەی قوتابییانی زۆرە، ئەوا دانانی خشـتەی وانـەکان قورسـتر دەبـێ، هـەروەها کـەمی پێداویسـتییەکانی قوتابخانـە و شـوێن، بۆیـە قوتابخانـەی دێهاتەکانیش دووچاری گەلێك گیروگرفت دەبن لەبەر کەمی مامۆستاو کەمی ژمارەی قوتابییان لەیەك پۆلدا، بۆیە ئەمەش دەبێتە هۆی فێرکردنی زیاتر لە یەك پۆل لەیەك ژووردا لەهەمان کاتدا لە لایەن یەك مامۆستاوەش .

جا بۆیەلەکاتی ڕێکخسـتن ودانـانی خشـتەدا پێویسـتە بەڕێوەبـەر و یاریدەدەرەکـەی ڕەچاوی ئەم خالآنەی خوارەوە بکەن، بۆ ئەوەی زیاتر هەولّ بدەین پرۆسەی پـەروەردە و فێرکردن بە شێوازێکی ڕێك و پێك جێبەجێ بکرێت :

١- پێویستە کاتی وانەکان و پشووی نێوان وانەکان بە گوێرەی وەرزەکانی سالّ دیاری بکرێت، چونکە کاتی وانەکان کەم و زیاد دەکرێ بـە گـوێرەی کـورت و درێـژی ڕۆژ، هەروەها بە گوێرەی قوتابخانەی یەك دەوام ، دوو دەوام ، سێ دەوام .

٢- دانانی وانەی بەڕێوەبەر دەبێ بەشێوەیەك بێت کە کار لـە کـار و چـالاکییەکانی بەڕێوەبەر لە قوتابخانەدا نـەکات، هـەروەها پێویسـتە وانـەی یەکـەم و کۆتـایی بـۆ بەڕێوەبەر دانەنرێت. لەبەر چـاودێریکردن و زانـینی مامۆسـتا نـەهاتووەکان یـاخود

دواکەوتووەکان، هەروەها قوتابییە نەهاتووەکان و چاوپێکەوتنی میوانانی قوتابخانە لە باوکی قوتابییان و ....هتد.

٣- لە هەموو خاڵەکان گرنگتر ئەوەیە دانانی خشتە پێش ئەوەی دەوام دەست پێبکات بە ماوەیەکی کەم بۆ ئەوەی مامۆستایان و قوتابییان ئاگادار بکرێنەوە و لەیەکەم ڕۆژەوە دەست بە دەوام بکەن. لەوانەیە هەندێ لە بەڕێوەبەرەکان پێچەوانەی ئەم ڕایە بن و بڵێن میلاکی قوتابخانەیان تەواو نییە، ناتوانین ئەمە جێبەجێ بکەین . ئەمەش تا ڕاددەیەك ڕاستە، بەڵام بەداخەوە زۆرجاردەبینین ئەو قوتابخانەی میلاکیشی تەواوە، کەچی مانگی یەکەم و مانگی دووەم دەڕوات خشتەی وانەکان ڕێك نەخراوە و بەردەوام گۆڕانکاری بەسەر دادێت، ئەمەش کاردانەوەیەکی خراپی لەسەر باری دەروونی مامۆستایان و قوتابییان دەبێت .

٤- پاش ئامادەکردنی خشتەی وانەکان بە حەز و ئارەزووی مامۆستایان و بەڕێوەبەر، نابێ بەهیچ شێوەیەك مامۆستایان داوای گۆڕین بکەن ، چونکە لەسەر حەز و ئارەزووی مامۆستایان خۆی دانراوە، تەنها لە کاتی زۆر پێویستدا نەبێ.

٥- پێویستە خشتەی وانەکانی هەفتە بە دوو دانە دروست بکرێ، یەکیان بۆ قوتابییان و ئەوی تریان لە ژووری مامۆستایان هەڵبواسرێ. پێویستە هەر مامۆستایەکیش خشتەی وانەکانی ئەو پۆلانەی دەیڵێتەوە لە پەڕاوی پلانەکانی دا نووسرابێتەوە تا بە تەماشاکردنی خشتەی وانەکان کات بە فیڕۆ نەدات.

٦- وا چاکە دانانی وانە هاوبەشەکانی نێوان زیاتر لە یەك پۆل، پێش وانەکانی تر دابنرێت بۆ ئەوەی بەریەککەوتن لە خشتەی وانەکاندا ڕوونەدات.

٧- دانانی ئەو وانانەی کە پێویستیان بە ماندوو بوونێکی هۆشی هەیە، وەکو بیرکاری و زانست و ئینگلیزی و کوردی دەبێ لە وانەکانی یەکەم دابنرێن .

٨- ئەو وانانەی کە پێویستیان بە هۆیەکانی ڕوونکردنەوە هەیە، پێویستە پاش ئەو پشووانە دابنرێن کە درێژن بۆ ئەوەی مامۆستاکان توانای خۆ ئامادەکردنیان هەبێ.

٩- دانانی وانە گرنگەکان لە ڕۆژانی یەکەمی هەفتەدا وەکو شەممە، یەك شەممە، و دووشەممە، چونکە سەرەتای هەفتەیە و دوای پشووی هەفتەیە و بۆیە چالاکی قوتابییان زیاترە.

١٠- دانانی وانەکانی چالاکی وەکو (سروود ـ وەرزش ـ هونەر) لە وانەکانی سێیەم و چوارەم، بەڵام هەندێ لە بەڕێوەبەرەکان ڕایان وایە لە کۆتایی وانەکان دابنرێ. لێرەدا قوتابی دووچاری بێزاری دەبێ.

١١ـ دەبێ ڕەچاوی ئەو دوو پۆلە بکرێت کە لەیەك نزیکن یان بەرامبەر یەکن، نابێ بۆ پۆلێك وانەی بیرکاری دابنرێ و بۆ پۆلەکەی تر وانەی سروود دابنرێ، چونکە کار لە یەکتری دەکەن.

١٢- نابێ دوو وانەی یەك بابەتی یەك پۆل وەکو زانست، لە یەك ڕۆژدا دووبارە دابنرێتەوە، بەڵکو پێویستە ماوەی هەبێ تاوەکو قوتابییان توانای خۆ ئامادەکردنی ئەرکی ماڵەوەیان هەبێ.

١٣- هەندێ جار لە قوتابخانەی لادێیەکاندا وا پێویست دەکات دوو پۆل یان زیاتر لەیەك ژووردا بخوێنن و لە لایەن یەك مامۆستاوە، بۆیە پێویستە بۆ یەکێکیان وانەی زارەکی دابنرێ و بۆ پۆلەکەی تریان وانەی کرداری، یان نووسینەوە دابنرێ بۆ ئەوەی کار لەیەك نەکەن. *

---

* لە گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی ژمارە (٤٧) ساڵی ٢٠٠٤ بڵاوکراوەتەوە .

# با ئێمەش کاژێك باوێین

**ن/ شوارێ**

لە چوارچێوەی چالاکی و چاکسازییەکانی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستاندا زۆر بە روونی و بەرچاو، ئەوە دەخۆێندرێتەوە کە زۆر چا پووك و ئازایانە، چاکی مەردایەتیان لێ کردووە بەلادا بۆ گۆڕین و لابردنی ئەو سیستەمە کۆنەی پەروەردەو فێرکردن و هێنان و لەبەرچاوگرتنی سیستەمێکی نوێی سەردەمیانەی ئەو تۆ، کە دەگەڵ رەوت و رێبازو شێوازی ژیانی سەردەمیانەی ئەمرۆ وئایندەی سبەی رۆژی دوورو نزیکدا بگونجێ ... ئەم بۆ چوون و تیخوێندنەوانەش هانیان دام، وەك مامۆستایەك کەمو زۆر دەستی هەوڵی هاوبەشی وپشتگیری و بەدواداچوون و

دەوڵەمەنـد كـردن لـەو بەرنامــەی كارانــەدا تێكــەڵ بــەكاروانی هــەوڵ و تەقەللایــە نەپساوەكانی ئەم بوارە بكەم، منــیش هاوبەشــیەكی خاكــە ڕایانــەم هــەبێت و بێمــە ناوگۆڕەپانەكەوە، بۆیە من لێرەوە لە بواری ئەوەنـدە پســپۆرییەی خۆمــەوە لەوانــەی بیركاریدا شەن وكەوی چەند لایەنێكی ئەم سیستەمە دەگەڵ ئەوەی كۆندا بكەم و رەش وسپییان لێك هەلاوێرم كەلەو چەندین خالآنەدا لە ( وانەی بیركاریدا ) چڕبوونەتەوە.

١- (پــەرتووكی بیركــاری بۆهــەمووان) بــەر لەهەمووشــتێك ئەوەیــە كــە ســەرنجی مامۆستاو قوتابی وەكو یەك بۆلای خـۆی رادەكێشــێ . كـە ئەمــەش دەبێتــە هــۆی وروژانی حەزو ئارەزووی مامۆستایان وقوتابییان بەرەو لای بابەتەكە.

٢- لە سیستەمە نوێیەكەی بیركاریدا، مامۆستا دەزانێ ئامــانج لــە ووتنــەوەی ئــەو بابەتەی دەیلێتەوە چیە .

٣- (پەرتووكی بیركاری بۆهەمووان) وا لــە مامۆســتا دەكــات، كــە ســەركردەو رێ نیشاندەرو ڕابەربێت و قوتابیش تەوەری سەرەكی.

٤- (پەرتووكی بیركاری بۆ هەمووان) والە مامۆستا دەكـات كـە زانیارییــەكانی بــە شێوازێكی راست و ڕەوان و بێ گـرێ بگەیەنێتــە قوتــابی، لــە كاتێكــدا سیســتەمە كۆنەكە مامۆستای تووشی هەزار گرێ وگۆڵ و دڵە ڕاوكێ دەكرد.

٥- (پەرتووكی بیركاری بۆ هەمووان) والە مامۆستایان دەكات كـە هــەر هــەموویان بەیەك رێ و یەك شێواز و لەسەر یەك تەوەر، وانــەی بیركــاری بلێنــەوە و نــاوەرۆكی بابەتەكەش وەكو یەك بگەیەننە هزرو بیری قوتابییان. كە لــە سیســتەمە كۆنەكــەدا هەر مامۆستایەك بەڕێگاو شێوازی خۆی و دوور لە تــەوەرێكی دیــاریكراو و چــۆنی ئارەزووبوایە و بۆی لوابا، ئاوا وانەكەی دەگوتەوە. ئەو دەمی قوتابی هەر قوتابخانــەو مامۆســتایەكی بیركــاری دەگــەڵ ئــی قوتابخانەیــەكی تــردا شــێوازی فێركــردن و

فێربوونەکەیان دەگۆڕا ... بەڵام سیستەمە نوێیەکە ڕەگی ئەم گیروگرفتەی بڕیوەو وشکی کردووە .

٦- لەم سیستەمە نوێیەی بیرکاریدا پڕۆگرامەکەی چارەسەری کاتی کردووە ... بەشێوەیەك والە مامۆستا دەکات کە بەگوێرەی کاتی بەرنامەکە کتێبەکە— پەرتووك— ەکە تەواو بکات، نەك هەر مامۆستایەو لەکاتی جیاواز جیاوازدا بەرنامەکەی بەکۆتابێنێ، یا تەواوی نەکات...

٧- لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا ناوەرۆکی پەرتووك و چۆنیەتی دابەشکردنی هەربەشێك بەسەر بەشەکاندا و چۆنیەتی دابەشکردنەوەی بەشەکانیش بەسەر وانەکاندا و چۆنیەتی ڕوونکردنەوەی هەربابەتێکی، تێکڕا لەسەر شێوازێکی زانستیانەی ڕوون دارێژراوە.

٨- لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا، مامۆستاو قوتابی ئارەزوویان بۆ بابەتەکان زیاد دەبێت ئەم لایەنەش لەپرۆسەی فێرکردن وفێربووندا زۆر گرنکە، چونکە ئەگەر هاتو ئەم ئارەزووە چ لای مامۆستا یا قوتابی نەما یا نەبوو، ئیدی ئەوە کرداری فێرکردن و فێربوونەکەش لەجێی خۆی رادەوەستێت و چەق دەبەستێ .

٩- (پەرتووکی بیرکاری بۆ هەمووان) زانیاری جۆراو جۆری تێدایەو وا لەمامۆستا دەکات کە بەناچاری — ئەگەر پێشی خۆش نەبێ - هەر بەدوای زانیارییەکاندا بچێت و زیاتر بخوێنێتەوە وپەرە بە زانیاری و فێربوونەکانی زیاتری خۆشی بدات.

١٠- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری یارمەتی مامۆستای بابەتەکان (وانەکان) ی تریش دەدات، وەك بابەتی جوگرافیاو مێژوو و زانست و دەبێتە هۆیەك بۆ زیاد کردن و وەسەریەك نانی زۆرێك لە زانیارییەکان و باشتریش دەوروبەرو ئەوشتانەی لەو دەوروبەرەشدا هەیە بەقوتابی ئاشنا بکا.

١١- ئەوەی بە سیستەمە نوێیەکەش فێربکرێ دەبێتە مرۆڤێکی زۆر رۆشنبیرترو وای لێدێ دەگەڵ پێشکەوتنەکانی سەردەمدا بەئاسانی هەنگاوبنێ.
١٢- سیستەمە نوێیەکە مامۆستا فێری پلان و نەخشە دانانێکی زانستیانە دەکات، کە بەداخەوە تا ئێستاش ئێمەی مامۆستا لەم بـوارەدا زۆر کلـۆلێن، بۆیـە هەمیشـە مامۆستا لە پلان و نەخشەی رۆژانەو مانگانەو ساڵانەیدا خۆی دووره پەرێز دەگرێت و خۆی لێ دەدزێتەوە .
١٣- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری رێگاکانی فێرکردن فێری مامۆسـتا دەکـات کـە چۆن و بەچ شێوازێکی جۆراو جۆر و زانستیانەتر وانە بڵێتەوە .
١٤- لـە سیسـتەمە کۆنەکـەی بیرکاریـدا مامۆسـتا (رێبـەر) ی نـەبوو، بـەڵام لـە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا، نەك هەر (رێبەری مامۆستا)، (پەرتووکی مامۆستا) و (پەرتووکی هەڵسەنگاندن) و (پەرتووکی دووبارە فێرکردن) و (پەرتووکی بەرەنگار) یشی هەیە، کە ئەمانەی هەموو کاتێك وەك هۆو ئامرازێکی زانستی بەدەستەوەیە تا پەرە بە تواناکانی خۆی و پرۆسەی فێرکردنی راست و زانستیانە بدات .
١٥- لە سیستەمە نوێیەکـەی بیرکاریـدا (پـەرتووکی مامۆسـتا) کـاتێکی زۆر بـۆ مامۆستا کەم دەکاتەوە و زۆر بە باشیش ئامانجی بابەتەکە بەدەستەوە دەدات ... لـە سیستەمە کۆنەکەدا ئەگەر (رێبەری مامۆستا)هەشـبووبێ هـەر بـە نـەبوو دانـراوە، چونکە یەکەم کتێبەکە بە زمانی عەرەبی بووە و مامۆستای کورد لەبـەر زمانەکـەی سوودی لێ نەدیوە، دووەمیش ئاماژەی لاپەڕەی رێبەرە عەربیەکەی مامۆستا دەگـەڵ لاپەڕەکانی (پەرتووکی قوتابی) دا جوور نەهاتۆتەوە و بۆتە مایەی ئاڵۆزی و پشتگوێ خستنی لەلایەن مامۆستاوە.

١٦- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری وا لە مامۆستا دەکات ڕۆژانە شارەزای یەك یەکی ئاستی زانستی قوتابیەکانی و فێربوونیان بێت، کە ئەم شێوازە لە سیستەمە کۆنەکەدا نەبوو و نیە.

١٧- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری یارمەتی مامۆستا دەدات پلانی بەلاوە گرنگ بێت و گرینگیشی پێبدات .

١٨- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری مامۆستا فێری چۆنیەتی پلان دانان دەکات، تا بەرێکی و ڕاستی و دروستی وانە بڵێتەوە.

١٩- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری زانیارییەکانی مامۆستاو قوتابی زیاتر دەکات لەهەموو بوارەکانی ژیاندا.

٢٠- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری وا لە مامۆستا دەکات هانا بۆ ئەم و ئەو نەبات لە شیکار کردنی هیچ پرسیارێکدا، چونکە هەموو پرسیارەکان وەڵامی خۆیان دە (پەرتووکی مامۆستا) دا هەیە. جگە لەوەش - مامۆستای وانەکانی تریش بۆ لای خۆی پەلکێش دەکات تا بیرکاری بکەنە هەوێنی وتنەوەی بابەتەکانیان — چونکە بیرکاری هەوێنی هەرچی بابەتێکی وردو درشتی ژیانە .

٢١- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری جگە لەوەی کە چالاکی مامۆستا زیاتر دەکات لە پۆلدا، قوتابییەکانیش والێدەکات بە هەڵپەوە بەرەو پیری فێربوونی ئەو بابەتەوە بچن کە مامۆستا دەیهەوێ فێریان بکات.

٢٢- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری مامۆستا هاندەدات و ناچاریشی دەکات هۆیەکانی فێرکردن بەکاربێنێ .

٢٣- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری، هانی مامۆستایان دەدات ئـارەزووی ووتنـــەوەی وانەی بیرکاریان زیاتر بێت، بە پێچـەوانەی سیســتەمە کۆنەکـەوە، کـە تـا دەهـات ئارەزووی ووتنەوەی بیرکاریان لەلا بەرەو نەمان دەچوو.

٢٤- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری مامۆستا فێردەکات، هەنگاو بەهەنگاو و قۆنـاغ بەقۆناغ قوتابییان فێر بکات و پەرتەوازە نـەبێ و بـە شـێوازێکی نـوێ قوتابییـان بگەیەنێتە ئەنجامی فێرکردنێکی سانا و زانستیانە .

٢٥- لە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاریدا مامۆستا و قوتابی هەمیشە تووشی وەڕەزی و بێ تاقەتی دەبوون لە فێرکردن و فێربووندا، چونکە رەوشەکەی داخـراو بـوو، بـەڵام ئێستا لەم سیستەمە نوێیەی بیرکاریدا قوتابی بەسەر جیهانێکی کراوە و تەکنۆلۆژیای سەردەمدا دەڕوانێ و دەگەڵیدا ئاوێتەو دەستبەکارە.

٢٦- لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا دۆسیەی مامۆستا هەیە، کە دەتوانێ بە هۆی ئەو دۆسییەوە سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی خۆی دیاری و دەستنیشـان بکـات و خـۆی خۆی هەڵسەنگێنێ.

٢٧- لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا (پەرتووکی مامۆستا) والە مامۆستا دەکـات کە خودی خۆی تاقیبکاتەوە و کەموکوورییەکانی خۆی بزانێت .

٢٨- جاران لە سیستەمی کۆندا مامۆستا بێ بەرنامە وانەی دەگوتەوە، بەڵام ئێسـتا لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا بەرنامەیەکی توکمەی لەبەر دەستدایە کـە وانـەی پێدەڵێتەوە .

٢٩- لـە سیســتەمە نوێیەکـەدا مامۆسـتا فێـری چـۆنیەتی دانـانی پرسـیارەکانی ئەزموونی دەبێت بە شێوە و شێوازێکی زانستیانە.

٣٠- له سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریـدا (پـەرتووکی مامۆسـتا) هەمووشـتێکی بـۆ مامۆستا روون کردۆتەوە، کە لە سیستەمە کۆنەکەدا ئەم ژێدەرە نەبوو.

٣١- پرۆگرامەکانی ئەم سیستەمە نوێیە وا لە مامۆستا دەکـات، ئەگـەر پسـپۆری بابـەتی بیرکـاریش نـەبێت، ببێتەپسـپۆڕێکی بیرکـاری زۆر چـاك ... ئەمـەش ڕێ خۆشکەرە بۆ هەر مامۆستایەك بیـەوێ بیرکـاری بڵێتـەوە و هـیچ مامۆسـتایەکیش ناتوانێ خۆی لە گوتنەوەی بیرکاری بدزێتەوە.

٣٢- له سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا قوتابی کۆڵکەو تەوەری سەرەکییە، بەڵام لـە سیستەمە کۆنەکە دا مامۆستا تەوەری سەرەکی بوو، بۆیە قوتابی هەمیشە بێ ئاگاو وەڕەزی وانەی بیرکاری و ژووری پۆلەکەی بوو.

٣٣- لەپڕۆگرامی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا چالاکی قوتابی زیاتر دەبێت، جـا چ لە ناوپۆل یا لە دەرەوەی قوتابخانە و واشی لێدەکات کە بیرکارییانە بیربکاتەوە.

٣٤- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری، پەیوەندی نێوان ماڵ و قوتابخانـە تونـد و تـۆڵ و تۆکمە و بەهێزتر دەکات.

٣٥- لـەپڕۆگرامی سیسـتەمە نوێیەکـەی بیرکاریـدا، قوتـابی فێـری هاریکـاریی و یارمەتیـدان و کـاری هـەرەوەزی دەبـێ، جـا چ لـە نـاو قوتابخانـە و چ لـە دەرەوەی قوتابخانە.

٣٦- سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری وا لە قوتابی دەکات هەست بە کەسـایەتی خـۆی بکا و لەکاتی شیکارکردنی پرسیارەکاندا باوەڕو متمانەی بەخۆی بێت. بەپێچـەوانەی سیستەمە کۆنەکەوە .

٣٧- لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا، قوتابی دەتوانـێ بۆشـایی ئـەو خولیایانـەی پڕبکاتەوە، کە لەناخیدا دروست ببوون.

٣٨- پرۆگرامی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری وا لە قوتابی دەکات کە بەپلان ئەزموون بکات ، واتا لە (پەرتووکی هەڵسەنگاندن )دا روونی کردۆتەوە چەند جۆرە ڕێگاو شێوازی جۆراو جۆر هەیە تا قوتابی پێ هەڵبسەنگێنین ..بۆیە قوتابیش فێردەبێ بەپلان ئەزموون بکات . چونکە ئەو شێوازەش لە سیستەمە کۆنەکەدا نەبوو، بۆیە هەمیشە قوتابی لەئەزموون کردنێ دەترسا .

٣٩- ئەم سیستەمە نوێیەی بیرکاری دەرفەتی زیاتر بە قوتابییان دەدات، تا ئاستی تواناو فێربوونیان هەرچۆنێکە و لەچ ئاستێکدابێ هەڵبسەنگێنن.

٤٠- لەپڕۆگرامی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا، بیرو هزری قوتابییان زیاتر دەکرێتەوە و زانیارییەکان لەنێوان مامۆستاو قوتابییاندا بەرجەستەتر ئاڵوگۆڕ دەبن.

٤١- پڕۆگرامی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری وا لە قوتابییان دەکات کەوا پرسیار لەهزری خۆیاندا دروستکەن و بیری لێ بکەنەوەو چۆن چۆنی شیکاری بکەن.

٤٢- لەپڕۆگرامی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا ئارەزوو و حەزی قوتابییان بۆ هونەر زیاد دەکات و فێری وێنەکێشانیش دەبن. چونکە لە زۆر شوێنی بەرنامەی کارو پڕۆگرامەکەیدا داوای وێنەکێشانی لە قوتابییان تێدایە.

٤٣- لەپڕۆگرامی سیستەمە کۆنەکەی بیرکاریدا، قوتابی هەمیشە خۆی لە مامۆستای بیرکاری دوورە پەرێز دەگرت و هەرگیز حەزیشی بەچارەی نەدەکرد، بەڵام لەم سیستەمە نوێیەدا قوتابی هەوڵ دەدا مامۆستای بیرکاری خۆش بوێت و لێی نزیك بێتەوە.

٤٤- لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا هانی قوتابییە زیرەکەکان دەدات زیاتر هەوڵ بدەن و زیاتر بەرەوپێشترەوە بچن و هەروەهاش قوتابییە ئاست لاوازەکانیش دەخاتە جموجووڵەوە تا بەرەو پێشتر بچن.

٤٥- پرۆگرامی سیستەمە نوێیەکە هەوڵ دەدات قوتابیی لاواز نەمێنێ، تەنانەت (پەرتووکی دووبارە فێرکردن) هەر بۆ ئەوە دانراوە تا ئەوانیش بەلاوازی نەمێننەوە.

٤٦- پرۆگرامی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری قوتابی ئاگادار دەکاتەوە لە هەر هەڵەیەك کە دێتە پێشی. زۆرجاریش ڕێنمایی قوتابی دەکات کە تووشی هەڵە نەبێت، لە کاتێکدا ئەم شێوازە لە سیستەمە کۆنەکەدا نەبوو.

٤٧- هەر لاپەڕەیەك لەلاپەڕەکانی پەرتووکی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری، تاقیکردنەوەیەکی بچکۆلەی قوتابییانە .

٤٨- لەپرۆگرامی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا سەرنجی کەسوکاری قوتابییان رادەکێشی بۆ ئەوەی لەماڵەوە لەگەڵ منداڵەکانیاندا خەریك بن، بەهۆی ئەو هەموو شەوق وزەوقەی کەتێیدایە، بەتایبەتی لە (پەرتووکی بیرکاری بۆ هەمووان) دا کە سەرنجی تێکڕای کەسوکاری قوتابی و خودی قوتابی و مامۆستاش بەلای خۆیدا رادەکێشێ، وایان لێدەکات سەیری بکەن و بیخوێننەوە .

٤٩- لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا تەواوی ئەو هۆ و وێنە روونکردنەوانەی تێدایە کە لەگەڵ ژینگەی قوتابییەکاندا دەگونجێت و شتەکانیش لەدەوروبەری قوتابییاندا وە دەست دەکەون و قوتابیش فێردەکات، تا لەکاتی خوێندنی وانەکانی بیرکاریدا، چۆن سوود لەو هۆیانەی فێرکردن وەرگرێت کە لە دەوروبەرەیدا هەن.

٥٠- لەپرۆگرامی سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا، حیسابی تێکڕای هەموو وانەکانی بیرکاری و دابەشکردنی کراوە کە لەماوەی ساڵێکدا دەخوێندرێت.

٥١- لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا بیرۆکەکان بەشێوەیەکی نزیك لە هزری منداڵانەوە و بەگوێرەی ئاستی تەمەنی هەر قۆناغێکیان دارێژراون، تا وایان لێ بکا هەست بەبێزاری و وەرەز بوون نەکەن لەکاتی خوێندن لە پۆلەکاندا.

٥٢- لـەپڕۆگرامی سیسـتەمە نوێیەکـەی بیرکاریـدا، بیرۆکـەی نـاو بابەتـەکانی هەروانەیەك، زنجیرە بیرۆکەیـەك بـەدوا یەکـدا هـاتوون، کـەوا لـە قوتـابی دەکـات بیربکاتەوە و بەدواداچوونی هەبێت.

لە کۆتاییدا بە خاکە ڕاییەوە دەڵێم ... داوا لە خوێنەری ئەم بابەتەی خـۆم دەکـەم، کە ئەگەر کەموکووڕیەکم لـە شـێوەی دارشـتن و نـاوەڕۆکی زانسـتیانەی بابەتەکـە و لایەنی زمانەوانیدا هەبێت و، بۆشـاییەکی دەنێـو نووسـینەکەدا بـەجێ هێشـتبێ، بەگەورەیی خۆیان ببوورن. خۆ ئەگەر هەر کەسێکیش شتێکی زیاتر بخاتە سەر شارای بابەتەکە بۆ دەوڵەمەند کردنی ئەوا لە ئێستاوە دەستی ڕێزی بۆ بەسینگەوە دەگرم. ♥

---

♥ لـە ڕۆژنامـەی خـەبات لاپـەڕەی کاروبـاری کوردسـتان ژمـارە (٢٩٩٦) لـە ٢٠٠٨/١٠/١٤ بڵاوکراوەتەوە

# یادەوەری مامۆستایەك

**ن/شواری**

پایزە درەنگانێکی ساڵی (٢٠٠٢) بوو لە خەلیفانێ مامۆستا بووم، لە یەکێك لە ڕۆژەکانی هەفتەدا هەروەك سەردانێك چوومە گوندێکی نزیکی ئەو دەڤەرە بۆلای مامۆستایەکی هاوڕێم، کە لەوێ لە قوتابخانەیەکی دوو پۆلیدا (یەکەم و دووەم) مامۆستابوو و هەردووك پۆلەکەش پێکەوە لە تەنیا ژوورێکدا دەیانخوێند... زۆریشم حەز لەوە بوو ڕەوشی خوێندن و پەروەردەو فێرکردن لەلادێیەکاندا و لە نزیکەوە بە چاوی خۆم ببینم و بزانم چۆنەو چۆن بەڕێوە دەچێت (ئەڵبەتە هەر بۆ زانیاری خۆم و بەس).

بەهەر حاڵ وا ڕێککەوت وانـەی یەکـەمی مامۆسـتا بیرکـاری بـوو، داوای لێکـردم دەگەڵێدا بچمە پۆلێ، چووم...

* * *

دیارە قوتابیانی پۆلی یەکەمی سەرەتایی کە تازە بەتازە دێنە قوتابخانە ، هیچ نازانن و هیچیشیان نەخوێندووە تا بزانن ، بـە تایبـەتی لـە وانـەی بیرکاریـدا کـە هێشـتا ژمارەیان نەخوێندووە و هیچێ لەوبارەوە نازانن. دیارە فێربوونی هـەر ژمارەیـەکیش پێویستی بەکاتی گونجاوی خۆی هەیە، ئەوە منیش لـە دواوەی قوتابییـەکانی پـۆلێ لەسوچێکەوە دانیشتووم و سەرنجم داوەتە مامۆستاو چۆنیەتی گوتنەوەی ئـەم وانـەی بیرکارییە .

سەرەتا لە پۆلی یەکەمەوە دەستی پێکردو دەیویست ژمارە (٤ ) یان بۆ ڕوون کاتەوە (گەیشتبوونە ژمارە (٤) و پێیان بناسێنێت... بۆ ژمارە چوار، مامۆستا پرسیاری لە قوتابیانی پۆلی یەکەم دەکرد کە ئەم کۆمەڵەیـە چـەند دانـەی تێدایـەو هێمـای ئـەم کۆمەڵەیـە چـۆن دەنووسـێت . لێکـڕا قوتابیـانی پـۆلی دووەم دەهاتنـە دەسـت و وەڵامەکەیان دەدایەوە و دەیانگوتەوە (چـوار) چـەندجارێکان بـەم شـێوەیە پرۆسـەکە دووپات دەبووەوە ، بەبێ ئەوەی هیچیان لە مانای ژمارە (٤) بگەن ، ئەوە نەبێت کە هەر تەنیا کرداری لاسایی کردنەوەیان گرتبووە بەرودەیانگوتەوە...

دوای بیست دەقیقەیەك مامۆستا هاتەوە سـەروەختی قوتابییـانی پـۆلی دووەم، کـە بابەتی وانەی بیرکارییەکەی ئەمجارەیان لە پۆلی دووەمدا ژمارەیەك بووکە هێماکەی لە سێ ژمارە واتە (٣) ڕەنووسی بوو، ئەوجا خوێندن و نووسـینی هێمـای ناسـینەوەی،

یەکان و دەیان و سەدان... بەبەکارهێنانی ژمێریار بۆ پیشاندانی ئەو ژمارەیەیەی کە لە (٣) ژمارە پێکهاتووە...

مامۆستا لەسەر تەختە ڕەشەکە وێنەی ژمێریارێکی بۆ دروستکردن، خانەی یەکان و دەیان و سەدانی بەم شێوەیە لەسەر دیاریکرد:

قوتابیانی پۆلی دووەم : سێ خانەمان هەیە . یەکان و دەیان و سەدان.

قوتابیانی پۆلی یەکەم ، یەکەو دەردوو بەدوای وانـدا سـەریان دەلەقانـدو وەك پـۆلی دووەکان دەیانگوتەوە: یەکان و دەیان و سەدان بەری چ دارێکە.

ناچار مامۆستا بایدایەوە سەر پۆلی یەکەم و بێدەنگی دەکردنەوە . دووبارە مامۆستا پرسیاری دەکردەوە: خانەی یەکان چەند دانەی تێدایە؟

قوتابییانی پۆلی دوو: سێ دانە. هەمدیس قوتابییانی پۆلی یەکەم ، مامۆستا... سێ دیسانەوە مامۆستا بایدەدایەوەو یەکەکانی بێدەنگ دەکردەوە .

ئەمجارەش مامۆستا دەیپرسییەوە: خانەی سەدان چەند دانەی تێدایە ؟

قوتابییانی پۆلی دوو: پێنج دانە.

سەر لەنوێ پۆلی یەکەکان دەهاتنەوە وەڵام و وەك بەشیان خورابێ دەیانگوتەوە: پێنج. بێ ئەوەی هیچ لەوە بگەن کە پرسیارو وەڵامەکان ویەکان و دەیان و سـەدان کـوڕی چ بەرەبابێکن، هەر تەنیا خۆ تێهەڵاویشتن و لاساییکردنەوە بوو...

ئای کەوانەکە تەواو بوو، چ غەم و ئەندێشە و خەمۆکییەك دایگـرتم و چـۆن کەوتمـە دەریای قووڵی بیرولێکدانەوەو دەچ گێژاوێکمدا خۆ دیتەوە ... باشە، ئەوەیە میللەتی ژێر دەستەو چاو لەدەستی دوژمـن و زۆردارو سـتەمکار ؟ ئـەو دەم تێگەیشـتم کـە ئەوەی بە دەستەندەی بدرێتێ بەزگێك تێرەو بەهەزاران برسی...

ئای چەند ئومێدەوارم ئەم دیاردەو چەندانی تریش لەم بابەتانە، بڕۆن و نەیەنەوەو ئاوە وئاو چن، و قوتابی و قوتابخانەو مامۆستایانیشمان هەر نەبێت خاوەنی خێوی خۆیـان بن و هەناسـەیەکی ئۆخـەی پـڕ بەسـییەکانیان بـۆ ئاینـدەی ئـەم خـاك و نەتەوەیـە هەڵکێشن. *

---

*ئاسۆی پەروەردە ژمارە (٥٢) ساڵی ٢٠٠٥ بڵاوکراوەتەوە.

# نموونەکانی فریاکەوتنی پێش وەختی خاوەن پێداویستە تایبەتەکان

Early Intervention Models

مەبەست لەنموونەکانی ئەو جۆرە یا ئەو شێوە باوانەی پێشکەش کردنی خزمەتگوزارییەکانی فریاکەوتنی پێش وەختە. لەوچەند ساڵانەی ڕابوردوودا زۆر نموونە پەرەیان پێ درا. هەریەك لەو نموونانەش کاریگەری ئەرێنی ونەرێنی خۆیان هەبوو. هەندێکیش لەو نموونانە زۆر لە نموونەکانی دی گونجاوتر بوون بۆ کۆمەڵە منداڵانێك لە هەندێ شوێن یا لە هەندێ کۆمەڵگاکاندا.

لەم چوارچێوەیەشدا دێین باسی پێنج لەو نموونانە دەکەین کە ئەمانەن :

- فریاکەوتنی پێش وەخت لەماڵەوە.
- فریاکەوتنی پێش وەخت لەسەنتەر (مەڵبەند — ناوەند) دا.
- فریاکەوتنی پێش وەخت لەماڵەوە و لەسەنتەر (مەڵبەند — ناوەند) دا.
- فریاکەوتنی پێش وەخت لەڕێی پێش کەش کردن و ڕێنمایی کردنی دایکان و باوکانەوە.
- فریاکەوتنی پێش وەخت لە نەخۆشخانەدا.

# فریاکەوتنی پێش وەخت لەماڵەوە :

Intervention Home- Base Early

ئەم خزمەتگوزارییە لە ماڵەوە پێش کەشی منداڵ دەکرێ . ڕاهێنەر یا مامۆستای خێزان هەفتەی جارێك هەتا سێ جار دەچێتە ماڵەکە . ئەم نموونەیەش بە زۆری لە گوند و لادێ و ئاواییيە دوورە شارەکاندا جێبەجێ دەکرێت چونکە هێنان و بردنەوەی منداڵە خاوەن پێداویستەکە بۆ مەڵبەند (مرکز) ە تەرخانکراوەکە گران و دژوارە . لەوانەیە هێنان و بردنەوەی منداڵەکە کاتێکی زۆری بوێت . وکەمیش وایە منداڵە خاوەن پێداویستەکان ماڵ و جێگاکانیان لەیەکترەوە نزیك بن . بەشی زۆری ئەم نموونەیە بۆ خزمەتگوزاری ئەو منداڵانەیە کە تەمەنیان لە (٢) دووساڵان کەمترە ،

بەڵام منداڵە گەورەترەکان ئەوە خزمەتگوزاری پێش وەختیان هەر لەماڵەوە پێشکەش دەکرێ

بـەگوێرەی ئـەم نموونەیـەش، پسـپۆڕ منداڵەکـە هەڵدەسـەنگێنێ بـۆ زانـین و دەستنیشانکردنی ئـەو کارامەییانـەی منداڵەکـە پێویسـتیەتی فێـری ببـێ. ئینجـا ڕاهێنەر یا مامۆستای خێزان، مەشق بەکەسوکار یا سەرپەرشتیکارانی ئەو منداڵانـە دەکـەن، لەسـەر چـۆنیەتی جێبـەجێکردنی چـالاکی مەشـقەکان. ڕاهێنـەر بـە دوای کەسوکاری منداڵەکانەوە دەبێ و چاودێری جێبـەجێ کردنـی چـالاکییەکانیان و ئـەو پێشکەوتنەی منداڵەکان دەکات، کە فێری بوو ون و وەریان گرتووە. گرینگترین بەشی کاری ڕاهێنەر مەشق پێکردنی کەسوکار و سەرپەرشـتیکارانی منداڵەکانـە باشـترین شێوەش بۆ ئەم کارە ئەوەیە، کە ڕاهێنەر بە کەسوکارەکان بڵێ کە دەبێ چی بکەن، و ئینجا بۆیان ڕوون بکاتەوە کارەکە چۆن دەکەن و ئینجا داوا لەو کەسوکارانە بکات کە چـالاکییەکە لەبـەر چـاوی ئـەودا بکـات، و دوایـیش ئافـەرین و دەستخۆشـی لـەو کەسوکارانە بکات بۆ ئەو کارەی کردوویانە. و دەبێ کەسـوکارەکانیش لەسـەر ئـەوە ڕابهێنرین کە (بەیانات) کۆبکەنەوە تا مامۆستای خێزانییەکـە بتوانـێ کاریگـەری و هەژموونی چالاکییە مەشقییەکان هەڵسەنگێنێ .دەتـوانرێ سـوود لـە هاریکـاری و یارمەتی مامۆستایانیش لە جێبـەجێکردنی فریاکـەوتنی پـێش وەخـت لەماڵـەوەدا ببینرێت، بەمەرجێك لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی مامۆسـتایانی پسـپۆر ومەشـق دیتوو و ڕاهێنەرانی فریاکەوتنی پێش وەختدا بێت.

بەمجۆرە کەسوکار بەگوێرەی ئەم نموونەیە دەبێتە ڕاهێنەری ڕاسـتەقینەی فریاکـەوتنی پێش وەخت لە ماڵەوە، هەر ئەویشە کە هەموو چالاکییە مەشقییەکان بۆ منداڵەکـە ئەنجام دەدات و جێبەجێیان دەکات.

## لایەنە باشەکانی ( ئەرێنی ) ئەم نموونەیە :

- بەهاناوە هاتن و فریاکەوتنی ئەو منداڵانەی ناگەیەنرێنە سەنتەر(ناوەند) ەکانی فریاکەوتنی پێش وەخت.

- فریاکەوتنی پێش وەختی ماڵەوە هیچی وای تێناچێ.

- مەشق و ڕاهێنانەکان هەر لە ژینگە سرووشتییەکەی منداڵەکەدا دەکرێ، بۆیە گشتگیری کارامەییەکان نابنە گیروگرفت.

- دایك و باوکەکان پێکەوە هاوبەشی فێربوونی منداڵەکەیان دەبن و ئەوانیش لەلایەن پسپۆڕانەوە بەو زانیاریانە پشتگیری دەکرێن کە پێویستیانە .

## لایەنە خراپەکانی( نەرێنی ) ئەم نموونەیە:

✵ - ئەم نموونەیە ئەرکێکی زۆر چڕوپڕ دەخاتە سەرشانی دایك وباوکان.

✵ - هەندێ کەسوکار نابنە ڕاهێنەر یا مامۆستای باش ... یان هەر ڕاهێنەر و مامۆستای باش نین.

✵ - لەبەر ئەوەی مەشقدانی منداڵ لە ئەستۆی کەسوکارە، بۆیە بەخۆ ڕاپەرموون و ئامادەگی کەسوکارەکە زۆرگرنگە. ئەگەر کەسوکار گیانی بەخۆڕاپەرموون و ئامادەگییە ئەو کارەی کەم بێ، ئەوا یارمەتی پێشکەوتنی منداڵەکە نادا.

✵ - لەبەر ئەوە منداڵەکە ناچێتە سەنتەر (مەڵبەند – ناوەند) و هەر لەماڵەوەیە دایك و باوکەکە پشووی تەواو نادەن کەمتر دەحەسێنەوە.

✵ - لەوانەیە مەشقیماڵەوە هێندە چڕوپڕی و ئەو کاریگەریەی سەنتەر (مەڵبەند — ناوەند) ە کانی نەبێ.

✵ - لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنی منداڵەکەو بێ بەریبوونی لەتێکەڵیە نێو ئاواڵـەکانی وا لە فریاکەوتنەپێش وەختەکە بکا نموونەیەکی داخراوی لێ دەربچێ و منداڵەکـە لـە دەوروبەر دابڕێ.

✵ - لە وانەیە مامۆستا خێزانیەکە کاتێکی زۆر بەبەرێوەهاتنـەوە لەسـەر ڕێگاکـان بەسەر بەرێت کە ئەمەش مانـای لـە دەسـتدان و کـەم بوونـەوەی کاتـە بـۆ پـلان و نەخشەدانان و فێربوونێ.

# بەرنامە ( پرۆژە) ی پۆرتاج

Project Portage

## پێناسەی گشتی:

بەرنامەی پۆرتاج لەسەر ئاستی جیهانی، بەناوبانگترینی زۆربەی زۆری فریاکەوتنە پێش وەختەکانی ماڵەوەیە، کە پێی دەگوترێ بەرنامەی رۆشنبیریی ماڵەوە بۆ مەشق و راهێنانی دایکانی منداڵە خاوەن پێداویستەکان. پرۆژەی پۆرتاج پرۆژەیەکی فێرکردنی فریاکەوتنی پێش وەختە، کە بەسەر ئەو منداڵانەدا جێبەجێ دەکرێ کە خاوەن پێداویستی تایبەتن کە هەر لە رۆژی لە دایکبوونەوە دەست پێ دەکات تا تەمەنی (٥) پێنج ساڵی، دەشتوانرێ بەپێی پێویستی منداڵەکەو ئاستی خاوەن پێداویستییەکەشی تا تەمەنی (٩) نۆ ساڵان بخایەنێ.

ئەم پرۆژەیــە مەشــق و ڕاهێنــان بــە دایکــان دەکــات، لەســەر چــۆنیەتی فێربــوونی منداڵەکانیان و هەڵسوکەوت لەگەڵ کردنیان. بۆیــە ئــەوە بەرنامەیــەکی ڕۆشــنبیریی دایکانە، کــە ئامادەیــان دەکــات تابنــە مامۆســتای ڕاســتەقینەی منداڵــە خــاوەن پێداویستە تایبەتەکانیان، و بەرنامەکــەش بەســەر دایــك و منداڵەکــەدا و هــەر لــە ماڵــەوەش جێبــەجێ دەکــرێ، چــونکە زۆر گونجــاوترە بــۆ منداڵەکــە و دەوروبــەرو ژینگەکەی. وە ئەم بەرنامەیەش هەفتەی جارێك و بۆ ماوەی کاتژمێرونیوێك سەردانی دایك و منداڵەکە دەکات. ئەم پرۆژەیە هەر تەنیا خزمەتی ئەو منداڵانە دەکــات کــە کاڵفام و کەم جووڵەن و تووشی ئیفلیجی سادەو مامناوەندی مێشك هاتوون و، کەڕ و لاڵ و کوێرەکان ئەو منداڵانەش ناگرێتەوە کــە کــەم ئەندامییەکــەیان یــەکجار زۆر و کاریگەرە.

## ئامانجی پرۆژەکە :

پێشکەش کردنی بەرنامەی ئامادەکردنی پێش وەخت لەناوماڵ و ژینگەی منداڵدا.

١- دۆزینەوەی پێش وەختی کەم ئەندامیەتی، ئــەوەش لــەڕێی هەڵســەنگاندنی ئــەو منداڵانەی کێشەی گەورەبوون و هەڵدان و وگەشەکردنیان هەیە و هەر لە منداڵیــەوەو لە تەمەنێکی زووەوە بخرێنــە نــاو ریزبەنــدی و داتــای بەرنامــەی فریاکــەوتنی پــێش وەختەوە .

٢- هاوبەشی پێ کردنــی راســتەوخۆی کەســوکار لــە پرۆســەی مەشــق و ڕاهێنــان و فێرکردنی منداڵەکانیاندا، کە ئەمە بە هۆیەکی زۆرکاریگەر دەژمێردرێ لەسەر منداڵ و زیاد کردنی کارامەییەکانی، کە یارمەتی راهاتنێی دەدا لەژیانی رۆژانەیدا.

٣- مەشق و ڕاهێنانی بەردەوام و زیاتری دایکان لەسەر هۆیە پێویستیەکان زێتر دەکات بۆ چاوەدێری منداڵەکانیان.
٤- پێشکەش کردنی ئەو بەرنامانەی دەگەڵ ڕۆشەنبیریە ناوچەیی و خۆجێیەکاندا دەگونجێن و باس و بابەتی فێرکردنی تایبەتییان تێدایە کە کاریگەری و هەژموونی هەستی و لەشییان تێدایە و یارمەتی گرنگیدان بە خودەوە، دەدەن.
٥- جێبەجێکردنی هەنگاوە کردەییەکانی بەرنامەکە، بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی تێکچوونی شیرازەی ژیانی ڕۆژانەی خێزانەکە.
٦- دەستنیشان کردنی خاڵە لاواز و بەهێزەکان لە منداڵە کەم ئەندامەکەدا، بە مەبەستی دارشتنی بەرنامەیەکی تایبەت بەوەوە، کە لەسەر بنەمای زانیارییەکانی ئێستای و توانایەکانی بە یارمەتی دایکەکە ئەنجام بدرێ.
٧- بەکارهێنانی بەرنامەیەکی دارێژراو لە چۆنیەتی بەرەوپێش چوونەوە کە وەك ئامرازێکی فێرکردن بەکار بهێنرێت .

## لایەنە ئامانجەییەکان:

لایەنە دەستنیشان کراوەکان (لایەنە ئامانجەییەکان)
١- منداڵ هەر لە لەدایکبوونەوە تا تەمەنی (٩) نۆ ساڵی.
٢- کەس وکاری منداڵەکان و خزمەکانیان و خەڵکی گەڕەکێ.
٣- کارگوزارانی دامەزراو و ڕێکخراوەکانی خاوەن پێداویستە تایبەتییەکان.

## خەسڵەتەکانی پرۆژەکە:

خزمەتی هەموو خێزانەکان دەکات جا لە هەر ئاستێکی ئـابووری و گوزەرانـدابن. و یەکێك لەخەسڵەتەکانی بەرنامەی فریاکەوتنی پێش وەختی ماڵەوەش گەیشـتنە بـەو منداڵانەی تەمەنیان زۆر بچـووکە و لـە شـوێنی جیـاواز جیـاوازو دوورە دەسـتدان. ڕاهێنەرێکی خێزانی بەتەنیا دەتوانێ هەر هەفتەی خزمەتگوزارییـەکانی بگەیەنێتـە (١٥) پازدە خێزانان. بۆیە تا ژمـارەی مامۆسـتایەکان لەبەرنامەکـەدا زیـاتر بێـت، خێزانە سوودمەندەکانیش لە پرۆژەکەدا زیاتر دەبن، بەتایبەتی ئەو خێزانانەی لە هیچ نموونەیـەکی خزمەتگوزاریـدا پشـکیان بەرنەکـەوتووە، جـا لەبـەر دووری شـوێنی دانیشتنیان یا لەبـەر بچـووکی تەمـەنی منداڵـەکان یـا لەبـەر نـەگونجانی بەرنامـە پێشکەش کراوەکەی دامەزراوەکەوە بووبێ بۆ منداڵەکان. لەوەش گرینگتر نـەتوانینی دامەزراوەکان لە وەخۆگرتنی هەموو منداڵە خاوەن پێداویستە تایبەتەکان، هـەروەها لە توانادا نەبوونی کەسوکاری منداڵەکان بەتایبەتی هەژارەکانیان، کە لـە توانایانـدا نەبووە ئەو نرخەگرانانەی ئەو سەنتەر و دامەزراو و تایبەتییانە بدەن کە داوای دەکەن.
ئـەو خزمەتگوزارانـەی کـە لـەو بەرنامەیەشـدا کـار دەکـەن، مـەرج نیـە خـاوەن گەواهینامە(شەهادە)ی بەرزی زانکۆ بن، بەڵکە خاوەن گەواهینامەیەکی قوتابخانەی ناوەنـدی دەتوانێ بچێتە خولێکی مەشق و ڕاهێنانەوە ولێی دەرچـێ، تاقیکردنـەوەکان سـەلماندوویانە کە هەڵبژاردن و دیاریکردنی مامۆستای هەمان ژینگـەی کـە لـە دواییـداکاری تێـدا دەکـا ئاستی لێك تێگەیشتنیان لە نێـو ئـەو خێزانانـەی خزمـەتگوزاری وەردەگـرن و دەگـەڵ دارو دەستەی بەرنامەکەدا زۆر زۆرە، دوایەش ئەمە دەبێتە هۆی سەرکەوتن و باوەڕ و متمانـە بـە یەکتریبوونێکی زۆر سەرکەوتووانە لە نێو هەردوو لایاندا.

## توخمەی پرۆژەکە :

ئەو پرۆژە پۆرتاژە نموونەییەی، کە بەرنامـەی فریاکـەوتنی پـێش وەختـی ماڵـەوەی بەدوادا دێت، چالاکیەکانی خۆی لـە وڵاتـە تـازە گەشـە کردووەکانـدا لـە بەرامبـەر کەسـوکاری خـاوەن پێداویسـتە تایبەتەکانـدا سـەلماند، ئـەویش بـەو شـارەزایی و کارامەییە بنچینەییانەی دەیانداتێ و کاریگەرییەکی تەواو گرینگی لەسـەر لایـەنی فێرکردن و بەرەو پێشچوونەوە هەیە.

## خوو و ڕەوشت و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکانی مامۆستایانی کارگوزاری ناو پرۆژەکە :

١- پێویستە لەسەر مامۆستای خێزانی دیمەنێکی لێوە شاوەی گونجاو و لەباری هەبێ لەکاتی سەردانانەدا.

٢- مامۆستای خێزانی دەبێ مرۆڤێکی زۆر ئەرێنیانە بێ لە گرتنەبەری ڕێ و شوێن و شێوازەکانیدا.

٣- مامۆستای خێزانی دەبێ گوێی کراوە و گوێ ڕاگربێ .

٤- مامۆستای خێزانی دەبێ باش ڕێزی خـوو و خـدە و نەرێتـەکان بگرێـت و دەبـێ هەموو کاتێکی ئەوەی هەر لە بیر بێ کەلە ناو ماڵەکاندا میوانە.

٥- لەسـەر مامۆسـتا پێویسـتە هەمیشـە جێـی متمانـەی پاراسـتن و نەدرکانـدنی نهێنیەکان بێ.

٦- مامۆستای خێزانی دەبێ شێوازی گونجاو و لەبار هەڵبژێرێ بۆ قسە وگفتوگۆ و دواندنەکانی.
٧- مامۆستای خێزانی دەبێ تا ئەندازەیەکی زۆر نەرم و نیان و لەسەرە خۆبێ، چونکە کاری ناومالّ وەك کاری ناو پۆلّ نیە.
٨- مامۆستا دەبێ کەش و هەوایەکی گشتی بۆ فێربوون ئامادەبکات و برەخسێنێ.
٩- رەفتاری مامۆستا زۆری لەسەر دەکەوێ چونکە هەمیشە جێی سەرنج و تێبینی کەسانی دیکەیە.
١٠- مامۆستای خێزانی دەبێ ئامانجی فێربوونەکە لێك داتەوەو ڕوونی کاتەوە.
١١- مامۆستای خێزانی دەبێ ئەوەی پەیوەندی بەسەردانەکەیەوەیەتی وەك کات و جۆر و ژمارەی ئەو چالاکییانەی دەیهەوێ فێریان بکات هەموویان ڕێك بخات و ڕوونیان بکاتەوە.
١٢- مامۆستای خێزانی دەبێ دایکەکە لە دانانی پلانی فێرکردنەکەدا بەشدار بکات.
١٣- مامۆستای خێزانی دەبێ زۆری ئاگا لە ئامێر و کەل و پەلەکان بێت و باش بیانپارێزێت و لە جێیەکی گونجاویان دانێ و هەر کاتێ ویستی بەکاریان بێنێ لەبەر دەستدابن.
١٤- دەبێ هۆیەك هەر بدۆزرێتەوە بۆ مژوول و سەرقالّ کردنی منداڵەکانی تری ناو خێزان لەکاتی جێبەجێ کردنی ئامانجەکاندا.
١٥- دەبێ جۆر و چەندیەتی ئەو ئامێرانەی بەکار دەهێنرێن، لەکاتی سەردانی ماڵەکاندا بەشێوەیەکی وا دیاری بکرێن، کە لەگەڵ چالاکییەکاندا بگونجێن .

١٦- دەبێ مامۆستای خێزانی جەخت لەسەر دایکەکە بکاتەوە داخوا لەو چالاکییانە گەیشتووە، کە لەسەر منداڵەکەی جێبەجێی دەکا، ئەوەش بە کردنەوەی نموونەیەکی چالاکییەکان لەبەردەمی خودی مامۆستاکەدا.
١٧- دەبێ خێزان لەهەموو بار ودۆخێکی ئەو گۆڕانکاریانە ئاگادار بکرێتەوە، کە بەسەر کات و شوێن و مۆڵەت و خشتەی سەردانەکاندا دێت.

١٨- دەبێ ڕۆڵی دایك بە تەواوی و بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکراو بە دوور و درێژی دەستنیشان و دیاری بکرێت، ئەگەر پێویستیشی کرد ئەوە هانا بۆ بەرپرس و پسپۆڕانی ئەم بوارە ببردرێتەوە و تا دەشکرێ هانی متمانە بەخۆبوون بە خودی دایك و باوکەکان بدرێ .

١٩- مامۆستای خێزانی دەبێ ڕێزی پەیوەندییە پیشەییەکانی زۆر لەلایێ و کاتێکی زۆر کەم بۆ پەیوەندییە تایبەتی و کۆمەڵایەتییەکان دابنێ، ئەوەیش لە کۆتایی سەردانەکەدا.
٢٠- مامۆستای خێزانی دەبێ دایکەکە لە هەموو گۆڕانێکی باش، کە بەسەر منداڵەکەدا دێت دڵنیاکاتەوە، چونکە کەمترین باشی دەبێتە مایەی سەرکەوتنێکی گەورە و دەبێ مامۆستاش هاوبەشی خێزانەکە لەو خۆشییەدا بکات وەك هاندانێك و پشتگیری پێوەندییەکانی نێوان دایك و مامۆستایەکە .

٢١- نابێ مامۆستای خێزانی بەخۆی هەڵدا بڵی وخۆی بکاتە جێ سەرنج و تێڕامان.
٢٢- مامۆستای خێزانی نابێ خۆی بکاتە لەلەو دایەن لەناوماڵەکاندا .

٢٣- مامۆستای خێزانی پێیوا نەبێ دایکەکە لە هەموو شتێکدا تەواوە و هیچ هەڵەیەکی نیە و نەماوەو نایبێ.

٢٤- مامۆستای خێزانی نابێ داوای کارێك لە دایکەکە بکا دایکەکە حەزی لێی نەبێ.

٢٥- نابێ سەردانی بێ ئاگاداری پێشوەخت بکرێت و بەبێ ئاگاداریش میوانان لەگەڵ خۆیدا ببات.

٢٦- لەبەر تەرخان کردنی تەواوی کاتەکە بۆ مەشق و ڕاهێنان، میوانداری قەدەغەیە.

# بەرنامەی سکای های: Ski Hi

بەرنامە خزمەتگوزاری و مەشق و ڕاهێنانەکانی سکای های (Ski-Hi) ساڵی ١٩٧٢ دەستی پێکرد و کارەکانیشی لەبەرنامەی فریاکەوتنی پێش وەخت و منداڵیەتی پێش وەختدا بۆ منداڵانی تازە لە دایکبوو تا تەمەنی پێنج ساڵانەدا چڕکردەوە، لەوانەی کە گیروگرفتی بیستن و دیتن و گرفتی دیکەیان هەیە.

پەیمانگای سکای های (Ski-Hi) بە یەکێك لە یەکە پسپۆڕییەکانی بەشی فێرکردنی درێژخایەنی دانیشگای پەروەردەی زانکۆی ویلایەتی یوتا دەژمێردرێ. و بەشەکانی لە ڕێی بەرنامەی کاراکردنی کۆمەڵگاییەوە لە (٥٠) پەنجا ویلایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو کەنەدادا بڵاو بۆتەوە.

هەر ئەو پەیمانگایەش یەکێکە لەو سێ یەکە تۆژینەوانە کە پسپۆڕن لە بواری خزمەتگوزاریی مرۆیی لە چوارچێوەی دانیشگا پەروەردەییە تایبەتییەکاندا. و پەیمانگای سکای های (Ski-Hi) کۆمەڵە کەسانێکی راوێژکاری تێدایە، کە ئیش

لەسەر پەرەپێدانی ئەو بەرنامەو نەخشەو پلانانە دەکـەن، کـە دەبنـە مایـەی باشـتر کردنی بارو دۆخ و ژیـانی منـداڵانی خـاوەن پێداویسـتی تایبـەت و خێزانـەکانیان و ئەوانەی کاریان لەگەڵدا دەکـەن . پـەیمانگا هـەموو هەوڵـەکانی خـۆی بـۆ هانـدانی منداڵان تەرخان کردووە، فێربن و پێ بگەن و بپشکنن و بدۆزنەوە و داهێنان بکـەن. ئەم چارەسەریەش یارمەتییان دەدات و ڕێیان بۆ خۆش دەکـا ببنـە ئەنـدامانی کـارا لەناو کۆمەڵگادا.

بەرنامەی پەیمانگایەکە خزمەتی نابیست و گوێ گرانەکان، و نابینا و کـەم بینـا، و نابیست و لاڵ و نابینا و زۆر گرفتی دیکەش دەکات. ئەو فێرکردنە پێش وەختەش کە پەیمانگا شانی داوەتە بەرێ پشت بە ماڵەوە، وەك ژینگەیەکی نموونەیی، دەبەستێت و لە کۆتایی بەرنامەکەشیدا دەسـت دەکـا بـە بـە دواداچـوونی حـاڵ وبـاڵ و وەزعـی منداڵەکە.

ئـامێر و ئامرازەکـانی بەرنامەکـە، لەلایـەن خێزانـە سـوودمەند بووەکـان و، پێشکەشکاری خزمەتگوزاری پسپۆر و، بەگشتی بەرنامەی پەروەردە تایبەتییەکانەوە دەبێـت، کـە ئـامێرو ئـەبزارو سەرچـاوەی بەرنامـەکانیش بـریتین لەمانـە: بەڵگـە ڕاستینەکانی خزمەتگوزار، نـەوارە ڕوونکـەرەوە ڤیدیۆییـەکان، و چـاپەمەنی و زۆر شتی تریش . ئەم کەل و پەل و ئامێرانەش تەنیا لە پەیمانگا و لقەکانیەوە لەکەنەدا و ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەست دەکەون، ولەلایـەن ڕاهێنـەرە خۆجێییەکانـەوە ئاراستەدەکرێن بۆ بەکارهێنانیان .

# فریاکەوتنی پێشوەخت لە سەنتەر

# (مەلبەند– ناوەند) دا

<u>Center Based Early Intervention</u>

لەم نموونەیەدا . منداڵ خزمەتگوزارییەکانی لەسەنتەر یا لـە قوتابخانـە پـێش کـەش دەکرێت. و زۆربەی ئەو خزمەتگوزارییانەش بۆ منداڵانی تەمەن دوو سـاڵانە تـا (٦) شەش ساڵانەیە.

منداڵەکان دەهێنرێنە سەنتەر، ئەوەش هەفتانـە چـوار هـەتا پێـنج ڕۆژ، ڕۆژەکـانی قوتابخانەش ماوەکانیان لە (٣) سێ کاتژمێرەوە بۆ (٥) پێنج کاتژمێرە. بـە زۆریـش سـەنتەرە فریاکەوتنـەکانی پێشـوەخت لـەناو شـارەکاندا دەبـن. جـاری وایـە خزمەتگوزارییەکانی سەنتەرەکان هەر بۆ دەستە منداڵانێکی خـاوەن گرفـت دەبـێ و بەس، دەشتوانێ خزمەتگوزاری پێش کەشی زۆر دەستەی هەمە جـۆری تـریش بکـا. فریاکەوتنی پێشوەخت لە سەنتەردا زۆر جۆرە خزمـەتگوزاری دەگرێتـەوە لـە بـواری گەشـەکردنی جیاجیـاوە. ئـەو خزمەتگوزارییانـەش لەلایـەن کەسـانی پسـپۆڕەوە بەهاریکاری هونەروەر یان یاریدەدەری پسپۆڕییەوە پێش کـەش دەکـرێن. دیـارە کـە

پسپۆڕەکانیش سوورن لە سەر ڕابەری و ڕێنمایی کردنی دایك و باوکـان و ڕاهێنـان و پشتگیرییان.

## لایەنە باشەکانی فریاکەوتنی پێشوەخت لە سەنتەر(مەڵبەند– ناوەند) دا

- تیمێکی پسپۆڕان لە سەنتەرەکاندا کار دەکەن.
- هەل بۆ منداڵەکان دەڕەخسێنێ تا لەگەڵ کەسانی تردا تێکەڵ بن.
- منـــداڵ بـــەبێ هاوبەشـــی دایـــك و باوکـــانیش لـــە ڕاهێنـــانی منداڵەکانـــدا، خزمەتگوزارییەکانی هەر پێ دەگا.
- پتەوکردنی پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵگا خۆجێییەکان، بەوەی کە سەنتەرەکان دەتوانن زۆر پەیوەندی لەگەڵ کەسانی ناو کۆمەڵدا پەیداکەن لەوانەی کە پاڵپشـتی دارایـی و مانەوەی سەنتەرەکان دەکەن، یا لەگەڵ ئەوانەی خۆبەخشـانە کـار دەکـەن، هـەروەها لەگەڵ زۆرانی تریش .

## لایەنە خراپ (نەرێنی )ە کانی فریاکەوتنی پێشوەخت لە سەنتەر (مەڵبەند– ناوەند ) دا

- گیروگرفتی هاتوچۆ و گواستنەوەی منداڵەکان (پاسـەکان و پاراسـتنیان ئـەرکێکی گرانە و زۆریشی دەوێ)، هەروەها پاسیش ماوەیەکی زۆر بەهاتن و چـوونەوە بـەفیڕۆ دەدات لە هێنان و بردنەوەی منداڵەکاندا .
- ئەرکی خانوو و بەرە و پاراستنی.
- هاوبەشی خێزان بە بەراورد لەگەڵ نموونەی فریاکـەوتنی پێشـوەخت لەماڵێـدا، زۆر لاوازە.

## فریاکەوتنی پێش وەخت لە هەریەك لەسەنتەر و ماڵەوەدا:

Early Intervention Home – and Center Based

ئەم نموونەیە دوو شێوەی سەرەکی لە خۆ دەگرێ:

**یەکەم** : پێشکەش کردنی خزمەتگوزارییەکان لەماڵێدا بۆ ئەو منداڵانـەی تەمـەنیان زۆر بچووکە، و لەسەنتەردا بۆ ئەو منداڵانەی تەمەن گەورەترن.

**دووەم** : دیاریکردنی خزمەتگوزارییەکانی فریاکـەوتنی پێشـوەخت بـۆ منداڵـەکان، هەریەکەی بە گوێرەی پێویستی خۆی. لەم نموونەیـەدا نەرمییـەك هەیـە. ئـەرێنی و نەرێنییەکانی ئەم نموونەیە لە ئەرێنی و نەرێنییـەکانی هـەردوو نموونـەکانی پێشـەوە دەچن.

## فریاکەوتنی پێشوەخت لەڕێی پێشکەش کردنی ڕاوێژ بۆ دایك و باوکان:

Consulation to Parents Model

ئەوە پێچەوانەی فریاکەوتنی ماڵەوەیە. لەمەدا دایك و باوکان لەگـەڵ منداڵەکەیانـدا هەفتانە دێنە سـەنتەر و لـەوێش پسـپۆڕەکان پێشـوازییان دەکـەن و ڕێ و شـوێن و ڕاوێژیان پێشان دەدەن و ڕێنماییيان دەکەن و ڕایان دەهێنن وچۆنیەتی جێبەجێ کردنی چالاکییەکانیان لەگەڵ منداڵەکەدا بۆ ڕوون دەکەنەوە.

یەکێك لەلایەنە ئەرێنییەکانی ئەم نموونەیە ئەوەیە، کە دایك و باوکەکان کەسوکار و سەرپەرشتکاری منداڵانی تر لـە نـاو سـەنتەرەکەدا دەبیـنن و پـێکتر ئاشـنا دەبـن،

ئەمەش دەبێتە دەستکەوت و پاڵپشتێکی تری ئەوان. ئەرێنییەکی دیکەی ئەوەیە کە پسپۆڕەکان منداڵ و خێزانەکە هەموویان دەبینن بەبێ چوونە ماڵێ. نەرێنییە سەرەکییەکەش ئەوەیە کە دایك و باوکەکە بەرپرسیاریەتە سەرەکییەکەی فێرکردنی منداڵەکەیان دەکەوێتە ئەستۆ و دەبێ راوێژ لەسەر کاروباری هاتوچۆش بکەن و مشووری بخۆن .

# فریاکەوتنی پێشوەخت لە نەخۆشخانەدا :

Hospital – Based Early Intervention

ئەم نموونەیە بۆ پێش کەش کردنی خزمــەتگوزاری ئــەو منداڵانەیــە، کــە بــارودۆخ و حاڵیان وا دەخوازێ، ماوەیەکی دوورو درێژ لە نەخۆشــخانەدا بمێننــەوە، یــا بــەردەوام سەردانی نەخۆشخانە بکەن (وەك تووشبووی نەخۆشی مێشــك و ئیفلیجــی مێشــك و درزی بڕبڕەی پشت). و لە پــێش کــەش کردنــی ئــەم خزمەتگوزاریانەشــدا پزیشــکی منداڵان و نۆشداری چارەسەری سروشتی و فەرمانبەرانی دیکەش هاوبەشی دەکەن.

فریاکەوتنی پێشوەخت لەڕێی هۆیەکانی بڵاوکردنەوەوە:

وەك تەلەفزیون و چاپەمەنی و فــیلم و نــەوار (کاســێت) و شــتی تــر، کــە بەشــێوەی بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا، بە زمانێکی پاراو و سادە و تەندروست، چــۆنیەتی کارەکــان بــۆ کەســوکار و سەرپەرشــتیارانی منداڵــەکان روون دەکرێتــەوە، کــە چــیبکەن بــۆ منداڵەکان. هەرواش باوە کە هەر بەڵگەیەك بۆ بابەتێکی دیاری کراو تەرخان کراوە.

## ئامانجی سەرەکی لە فریاکەوتنی پێشوەخت :

(یارمەتیدانی منداڵە بچووکەکان، بۆ گەشەو پەرەپێدان و فێربوون تا ئەو پلەیەی لــە توانا دایە و توانای منداڵەکان ڕێ دەدا)، تەمەنە ٣ساڵی و ٦-٨ ساڵیەکان دەتوانرێ لەڕێی ئەم جێگرەوانەوە خزمەت بکرێن :

- باغچەی تایبەتی منداڵان .
- باغچەی سادەی منداڵان .

- کورتــه دەوامێــك لــه باغچــەی تایبــەت و باغچــەی ئاســاییدا ( رۆژ یــا چــەند کاتژمێرێکان  له باغچەی تایبەتدا بەسەر دەبات و رۆژەکان و کاتژمێرەکانی دیش له باغچه سادەکەدا).

- ساڵێك له باغچەی تایبەتدا و ئەوەی دیش له باغچەی سادەدا.

- سەنتەر (مەلبەند – ناوەند) ی تایبەت.

## نەخشەی بەرنامەکە :

به دەوری سێ رەهەنداندا دەسوورێتەوە :

١- کۆکردنەوەو شیکردنەوەی زانیارییەکان له بارەی منداڵ و خێزانەکەیەوە.

٢- دیاریکردنی پێویستییە تایبەتەکان .

٣- بڕیاردان لەسەر فریاکەوتنی چارەسازی پێویست، بۆ وەڵامدانەوەو به پیرەوەچوونی پێویستییەکان. ♣

---

♣سەرچاوە : له Google کراوە به کوردی

١- موقع متخصص في التربية الخاصة / باشراف د. احمد احمد عولا

الصفحة الرئيسية / التربية الخاصة / التدخل المبكر .

اسم/ نماذج التدخل المبكر لذوى الاحتياجات الخاصة

کاتب / د. موفق سعيد الخطيب .

٢- به سێ بەش له ڕۆژنامەی خەبات دا بڵاوکراوەتەوە

– ژمارە (٤٣١٢) بەرواری ٥/٥/ ٢٠١٣ یەك شەممە

–ژمارە (٤٣١٧) بەرواری ٢٠١٣/٥/١٢ یەك شەممە

– ژمارە (٤٣٢٨) بەرواری ٢٠١٣/٥/٢٧ دوو شەممە

# هەموو تازەیەك نامۆیە

**ن/شوارێ**

لە ژمارە (٢٨٨٧) رۆژی یەك شەممەی ٢٢/٦/ ٢٠٠٨ بەناو ونیشانی (تێبینی و سەرنج دەربارەی سیستەمی نوێی بیرکاری) کە مامۆستای زۆر رێزدار و هێژا مامۆستا عەبدوللەتیف شەریف محەمەد لە رۆژنامەی خەباتی ئازیزدا نووسیبووی ... منیش وەك مامۆستایەکی بوارو وانەکە ... هەندێ بەدواداچوون و وردە سەرنجی بیرکارانەم دەربارەی ئەو سیستەمە نوێیەی بیرکاری لەلا دروستبوون، ناچاریان کردم، بۆ سوودی گشتی و هاوبەشی لەکاری هەرەوەزی بیروهزرو زانستیانە منیش بێم هەم لە وەڵامی سەرنج و تێبینییەکانی بەرێزیانەوە، هەم لەلایەنی خستنە رووی

بۆچوونەکانی خۆمــەوە، ئـەو هەنـدە شـتانە بخەمــە ڕوو و هــەر لەســەر لاپــەڕەکانی ڕۆژنامــەی خەباتــەوە وەك عــورفی ڕۆژنامــەوانی بــلاوی بکەمــەوەو بــەرێزو دەســت بەسینگ گرتنەوەوە داوا لەمامۆستای هێژامامۆستا عەبدوللەتیف شەریف بکەم وەك قوتابییەکی خۆی ئەگەر وردەکارییەکانمی بەدڵ بوو، یـا نـەبوو، بـا هــەر لـێم قبـول بفەرموێ و لێم زیز نەبێ ... کەلە ژێر ئەو ناونیشانەی سەرەوەدا دەرم بڕیون:

دوای هەڵدانەوەو سەیرکردن ولێ وردبوونــەوە و تــاوتوێکردنی (کتێبــی بیرکــاری بــۆ هەمووان)، باری سەرنجم لە هەڵسەنگاندنێدا کەوتە سەر زۆر لایەنی گونجان و نەگونجان و هەموار کردنی بابەتــەکانی، بەتایبــەتی ئــەو لایەنانانــەی کــە لەگــەڵ بــارو دۆخ و پێویستیە ژیارییەکانی ڕۆژانەی ژیــانی منــداڵی کــورددا  وەختیــەتی بــۆ فێربــوون و بەکارهێنانی لەم قۆناغەدا، چونکە هــەر نــەبێ ئــەم کتێبــە کتێبێکــی زانســتیانەی بیرکاری ڕووتەو دەستپێك و سەرەتایەکی یەکجار پتەوە بۆ بزاوتنــی مێشــك و هــزری منداڵانی کورد، و دەتــوانم بڵــێم ئــەم پرۆگرامــە دەبێتــە بــەردی بناغــەی فێربــوونی بیرکارییەکی زۆر سەردەمیانە و تاماوەیەکی زۆر مامۆستا وقوتــابی لــە گیروگرفتــی ئاڵوگۆڕو نوێکردنەوە دەحەسێنێتەوەو ســەرمایەیەکی زۆریــش بــۆ بودجــەی دەوڵــەت دەگێرێتــەوە و هەمیشــە و بــەردەوامیش ســالانە لەبەردەســت و دیــدی قوتابییانــدا دەبێ...

چونکە دەرفەتی زیاتر بە قوتابی دەدات کەئاستی توانا و فێربوونیان هەر چۆنێك ولــە هەر ئاستێك دابن لە فێربوونی  بیرکاریدا .

پێم خۆشە ئەوەش بڵێم کە لەم پرۆگرامەدا هەموو شتێك روونکراوەتەوە. بـەتێکرایی بۆ خوێندنی ئەم قۆناغەی منداڵانی کورد، کتێبێکی تا بڵێی شیاو وگونجاوە.
- مامۆستای زۆر ڕێزدار و هێژا مامۆستا عەبدوللەتیف شەریف دەفەرموێ :
(گۆرین لەبەرچی وکەی ؟!)

بێگومان بیرکردنەوە ساڵ بەساڵ لە گۆڕان دایـە. زۆرجـاران وەبـەر گـوێم دەکـەوت، کەوانەی بیرکاری وانەیکی وشکە چ لەلای قوتابی و چ لەلای مامۆستا، بەڵام گۆڕانی پرۆگرامی بیرکاری بەم شێوازە نوێیە دەبێتە هۆی ئەوەی مامۆستا خۆی ئامادەبکـات و مجێزی بۆ وتنەوەی بابەتەکە زیادبێ، بەحەزو ئارەزوویکی زۆرتـرەوە وانـە بڵێتـەوە. جاران لەبەر فانۆس خەڵك شەوی بەسەر دەبرد ئێستا جۆرەهـا ئـامێری سـەردەمیانە لەماڵەکاندا پەیدابووە . بچووکترین و زۆرترین شـت کەلـە ماڵەکانـدا بـەدی دەکـرێ کۆنترۆڵی تەلەفزیۆنە، منداڵ لە تەمەنی سێ ساڵی و چوار ساڵی و پێـنج سـاڵی دا، دەتوانێ کۆنترۆلەکە بەکاربهێنێ کام کەنالی بییەوێت لەسەری دابنێ. بەر لەوەی بێتە قوتابخانە، دەتوانێ بەراوردی ژمارەی سەر کۆنترۆلەکـە بکـات و ژمارەکـان بناسـێ، هەروەها کۆمپیوتەریش بەم شـێوەیە . جـاران ئەگـەر پاسـکیلك دەچـووە گونـدێك، خەڵکی گوندەکە دەوریان دەدا و دەیان گوت ئەسپی دووپێ هاتووە، خەلك سادەبوو. ئێستا ئەگەر بەراوردی خەڵکی شاری و خەڵکی گوند بکـەین هـیچ جیاوازیـان نیـە، چونکە ئەوانیش بە ئامێرەکـانی سـەردەم ئاشـنابوونە، بـۆ نموونـە موبایـل ئـەویش ئامێرێکە کە بیرکاریانە ئیش دەکات. زۆر لەوانەی خوێندەواریشیان نیـە، راهـاتوون لەبەکارهێنانی .

لەشوێنێکی تردا دەڵێ دژی گۆڕانکاری نیم بەڵام بەمەرجێ لەگەڵ واقیعی گەلەکەم بگونجێت ؟؟!!

ئەم سیستەمە بۆچی لەگەڵ واقیعی گەلەکەم ناگونجێت؟. چ شتێکی تێدایە ببێتە هۆی ئەوەی قوتابییان بەرەو هەڵدێر ببات؟، جگە لەوەی کۆمەڵێك شتی نایابیان لە زانستە نوێیەکانی سەردەم فێر دەکات و ئاشنایان دەکات بە کۆمەڵێك زانیاری پوخت لە هەموو بوارەکان، جگە لەوەش بیری قوتابییان فراوانتر دەکات. چاکترین شت لەم پەرتووکە نوێیەی بیرکاریدا، ئەو هەموو شەوق و زەوقەی تێدایە کە سەرنجی قوتابییان بۆ خۆی رادەکێشێ و وای لێ دەکات وردبێتەوە لە بیرۆکەی زانستی بابەتەکان. جاران پەرتووکێکی وشك و سارد و سڕ، کە هیچ گەرموو گوڕییەکی پێوە دیارنەبوو، قوتابی و مامۆستای وەرز دەکرد، مامۆستا نەیدەزانی چۆن بابەتەکە لە قوتابییان بگەینێ زۆر هیلاك و ماندوو دەبوو تا خۆشی بێزار دەبوو لەوەی کە چۆن وانەکە بلێتەوە. بەڵام بەم سیستەمە نوێیە ئەگەر مامۆستا پسپۆری بیرکاریش نەبێ، دەتوانێ وانەکە بەجوانی بلێتەوە، چونکە هەموو شتێکی وەکو هێلکە بۆ سپیکراوە. ئەمەش دەتوانین لە ئەلقەیەکی تردا باسی گرنگی هەر یەکە لە پەرتووکەکانی بیرکاری( پەرتووکی مامۆستا) و (پەرتووکی هەڵسەنگاندن) و(پەرتووکی دووبارە فێرکردن) و (پەرتووکی بەرەنگار) و(پەرتووکی قوتابی) و (پەرتووکی ڕاهێنان) بکەین و بەدرێژی روونی بکەینەوە.

- لەشـــوێنێکی تـــردا دەڵـــێ بەمەبەســـتی دەستنیشـــانکردنی کەمووکورتییـــەکان و لەدواییشدا چارەسەرکردنیان، دەپرسین ئایا راپۆرتی لەم جۆرە لەلایـەن مامۆسـتایانی بیرکاری بەرزکراوەتەوە؟

بەڵێ چەند جارێـك بەرزکراوەتـەوە لـە گۆڤـاری ئاسـۆی پـەروەردەش بڵاوکراوەتـەوە هەروەها لە هۆلی (ئامادەومەشق کردن) لە کاتژمێر (١٠) ی بەیانی رۆژی سێ شەممە لە رێکەوتی ٢٤/٥/٢٠٠٥، سیمینارێك سازدرا سەبارەت بەبیروبۆچوون و تێبینیەکان دەربارەی هەر شەش پەرتووکی بیرکاری قۆناغی سەرەتایی، دەربرین ئەوە بـوو چـەند راپۆرتێك بەرزکرایەوە، لەوانەش لە راپۆرتێکیاندا واتا بەر لە سێ ساڵ ئاماژە بە خالە لاوازەکانی پەرتووکی کۆن کرابوو، هەروەها داوای ئەم گۆرانکاریە کرابوو کەوا ئێستا لەم پرۆگرامە نوێیەدا بـەدی دەکـەم، ئـەوەش جێـی دڵ خۆشـییە نـەك لەبەرئـەوەی سیسـتەمە کۆنەکـە کـەڵکی نـەبووە، بـەڵکو لەگـەڵ گۆڕانکارییـەکانی سـەردەمدا نەدەرۆیشت .

جاری وا هەیە وەزارەت دەست پێشـخەری دەکـات لـەوەی لـەرێی پەیوەندییـەکانی دەرەوەو دنیای پێشکەوتنی تـازە، دەچـێ سیسـتەمی نـوێ و پرۆگـرام و هۆیـەکانی فێرکردنیان و، جۆری بەکارخستن و بەرێوەبـەردنی ئـەو شـتە نوێییانـە، دێنێتـە نـاو بەرنامەو کاری خۆی و کاری پێویسـتیان لەسـەر دەکـات و بـۆ ماوەیـەك لـە چـەند شوێنێکی تایبەت دا، تاقی کردنەوەی لەسەر دەکات، تـا ئەگـەر زانـی بەراژەیـەکی گونجاو قوتابییانی ئەو قۆناغەی سیستەمەکەی بۆ هاتووە، سوودی لێ دەبینرێ ئـەوا دەیخاتە بەرنامەی کاری قوتابخانەکان و دەخوێنرێ.

- له شوێنێکی تردا بەرێزیان دەفەرموون (ئایا لە کوردستان هیچ کەس نەبووە بتوانێ بەشداری لە گۆرینی ئەو پرۆگرامە بکات، کە بگونجێت لەگەڵ هزروبیری منداڵانی کورد. کوا رۆڵی ئەو هەموو زاناو پرۆڤیسۆرو دکتۆرانەی بیرکاری؟!.

بەڵێ بەپێی فرمانی وەزاری / پێکهێنانی لیژنە پسپۆرییەکان بەژمارە ٢٠٦٢ لەبەرواری ٢٠٠٧/٢/١٨ بۆ دراسەت کردنی تاکەکانی پرۆگرامی هارکورت، کۆبوونەوەیێك سازدرا. هەروەها لە بەرواری (٢٠٠٧/٢/٢٠ و ٢٠٠٧/٢/٢٦ و ٢٠٠٧/٣/٥ و ٢٠٠٧/٣/٦) کە دانیشتنی بەیانی و دانیشتنی ئێوارەی تێدا ئەنجامدراوە، کە کۆمەڵێك مامۆستای پسپۆرو زاناو پرۆفیسۆرو سەرپەرشتیارانی پەروەردەیی بیرکاری و بەئامادەبوونی شارەزای پرۆگرامەکانی بیرکاری لەدیوانی وەزارەتی پەروەردە، هەروەها بەئامادەبوونی ئەندامی لیژنەی پەروەردەو خوێندنی باڵا لە پەرلەمانی کوردستان. لەم کۆبوونەوانەدا کۆمەڵێك گۆرانکاری کراوە ئەو بابەتانە یاخود ئەو شێوازانەی کەلەگەڵ واقیعی ئێمەدا ناگونجێت لابراون حیسابی ژمارەی زۆری قوتابییان کراوە راهێنانی زۆر کەم کراوەتەوە.

گەلێ جاریش باس لەوە دەکرێ کە ئاستی زانستی قوتابییان لە قۆناغەکانی خوێندندا رووڵەدابەزینە. ئەگەر ئێمە بێین و باس لە ئاستی زانستی قوتابییان بکەین هیچ پەیوەندیەکی بەو سیستەمە نوێیەوە نیە.
چونکە ئەم سیستەمەی کە رەخنەی لێ دەگری هەمووی ساڵێکە تەمەنی. ئەو قوتابییانەی لەسەر سیستەمە کۆنەکە فێرکراون کە ئێستا لە پۆلی دووەمی ناوەندی (واتا قوتابی پۆلی هەشتەم) وبگرە بەرەو سەرەوەن، قوتابییەکانی تەنانەت کرداری

دابەشی درێژ نـازانن، لـە هـەمووی سـەیرتر قوتابییـەکی پـۆلی دووەمـی ناوەنـدی لەحالەتی وانە ووتنەوەدا لێم پرسی ( ٢ + ٠ = ؟ ) وەڵامەکەی بەم شێوەیە دامەوە مامۆستا ( ٢+ ٠ = سفر ) کەچی زۆریش پێ ی دادەگرت کە وەڵامی پرسیارەکەمی بەراستی داوەتەوە کۆمەڵێ شتی لەو جۆرانە، سیسـتەمە کۆنەکـەی بیرکـاری بـەڕای ئێمە هەموومانی لە قاڵبێکی تەسـك دا دەهێشـتەوە و نەیدەهێشـت بـە ئـارەزووی خۆمان شتەکان لێك بدینەوە .

بەڵام سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری هەرچەندە لەگەڵتم کە پێویستی بـە زیـادکردنی بینایەی قوتابخانە و کەمکردنەوەی ژمارەی قوتابییان لە پۆڵدا هەیە بەڵام نابـێ ئـەم هۆکارانەش وامان لێ بکات هەنگاو بەرەو پێشەوە نەنێین. بەڵێ وەکـو مامۆسـتایەك کە لەم بوارەدا وانە دەڵێمەوە سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و کەم و کووڕیشی دەبـێ، بەڵام نابێ ئێمە بڵێین سیستەمەکە خراپە. دەبێ هەنگاو بەهەنگاو کەم و کوڕییـەکان نەهێڵین و هەوڵی چارسەرکردنی وپرکردنەوەیان بدەین .

منیش وەکو بەرێزتان دەترسام لەوەی ئەم پرۆگرامە سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ، بەڵام بەرلەوەی لەسەر قوتابییانی پۆلی یەکەم تاقی بکەمەوە لەسەر منالێکی تەمەن پێنج ساڵیم تاقی کردەوە. بەبەڵگەشەوە دڵنیات دەکەمەوە کە هەموو شـتەکانی بـەجوانی لێ وەرگرتم لە سیستەمی نوێی بیرکارییەکەوە. هەر سێ ژمارەی (١ ، ٢ ، ٣) فێربوو هەرچەندە تەمەنی شەش ساڵیش نیە هەروەها بەراوردی نێـوان هەرسـێ ژمارەکـەش فێربوو کۆمەڵەشی دیار دەکرد کە بەچەند زیاترە و بەچەند کەمترە. هەروەها لـەکاتی کردنەوەی خولی یەکەمی بیرکاری لە بەرواری ٦ / ١٠/ تا ٩/ ١٠/ ٢٠٠٧، هەروەها

خـولی دووەمـی بیرکـاری لـە بـەرواری ٢٧/ ١٠ تـا ٢٠٠٧/١٠/٣٠ دا، هـەر بـۆ دڵنیابوونی مامۆستایان کۆمەڵێك لە قوتابییانی پۆلی یەکەم و پـۆلی دووەم و پـۆلی سێیەم، لەبەردەم مامۆستایانی خول وانەی مەشقییان لەسەر گوتراوەتەوە، بۆ ئـەوەی بزانین ئەم کاتەی دیاری کراوە دەگونجێ یان نا، یاخود قوتابییـانی پـۆلی یەکـەم ئـەم سیستەمە لەسەریان قورس نابێ، بە دڵنیاییەوە ئەگـەر هەسـتم بـەوە بکردبایـە کـە ناگونجێ، ئەوامنیش لەلای خۆمەوە بەرێوەبەرایەتی پرۆگرامەکانم ئاگادار دەکـردەوە. بەڵام زۆر بەجوانی قوتابییەکان کە بۆ یەکەم جاریش ئەو وانەیان بۆ گوتراوەتەوە هـیچ گرفتێکی نەبووە. هەروەها سەبارەت بە پـۆلی دووەم و پـۆلی سـێ یـەم لەبـەر زۆری پرسیارەکان رەنگە هەندێ کاتی زیاتری بوویت ئەمەش گرفـت نیـە، چـونکە سـاڵانە بەرێوەبەرایەتی پرۆگرامەکان بە کەمووکورتی ئـەم پەرتووکانـەدا دەچـێتەوە هـەولی چارەسەرکردنیان بۆ دەدات، دەبێ ئێمەش هەنگاو بە هەنگاو بەرەوپێشـەوەی بـەرین، کەواتە لاوازی ئاستی قوتابییان بۆ چەند هۆکارێکی تر دەگەرێتەوە کە ئەمە باسێکی ترەو بەدەر لە پرۆسەی سیستەمەکەیە.

لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموون ... (پرسـیارێك دەکـەم ؟ ئەگـەر ئـەم پرۆگرامـە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا ، ئەوە ئەنجامەکەی چی دەبێت و کێ لێی بەرپرسیارە ؟) ئەگەر بەم توندو تیژییە پێشوازی ئەم پرۆگرامە نوێییە بکەین ئەگەر پیـاو بـۆ خـوا قسەبکات پرۆگرامەکە هەروەکو خۆتان ئاماژەتان پێ کردووە :

(ئەگەر بەوردی سەرنجی ناوەرۆکی پەرتووکە کەبدەین ، دەردەکەوێ هەمان ناوەرۆکی پەرتووکە کۆنەکەیەو هیچ جیاوازییەکی لە ناوەرۆکدانیـە وەداواش دەکـەیت کەسـێك هەڵسەنگاندنی هەردوو پەرتووکە کۆن و نوێیەکە بکات).

جا ئەوەتا منیش لێرەدا دەپرسم: ئەگەر هەر هەمان ناوەڕۆك بن چ گرفتێکی هەیە کەواتە لە ناوەڕۆکی کتێبە کۆنەکە لای نەداوە، بەڵام بەرێگاو شێوازێکی رێکو پێکتر روون کراوەتەوە، چ بۆ قوتابی چ بۆ مامۆستا و چ بۆ دایك و باوکی قوتابی. کەواتە هەر ئەوەیە کە شێوازی گەیاندن و فێرکردنی قوتابییەکان بە شێوەیەکی نوێتر گۆڕاوە، کە هەر ئەوەشە مەبەستەکە. کەواتە ئێمە هەموومان لە شێوازی فێرکردنەکە بەرپرسیارین نەك لە ناوەڕۆکی کتێبە کۆن و نوێیەکە.

لەشوێنێکی تردا دەفەرموون ... (مامۆستایەکی بەناوبانگ و زیرەك، لە قوتابخانەی بەهرەدارانەو وانەی بیرکاری لە پۆلی شەشەم دەڵێتەوە، رای خۆی دەربارەی ئەو پرۆگرامە دەربڕی و لە وەڵامدا گوتی: کوڕێکم هەیە لەپۆلی دووەمەو شەوانە هەوڵی فێرکردنی دەدەم. بەڵام لەبەر زەحمەتی درەنگ فێر دەبێت).

بەڵێ ئێمە هەموومان ئەوە دەزانین، مامۆستای قوناغی سەرەتایی لەگەڵ مامۆستایانی قوناغی ناوەندی و دواناوەندی زۆر جیاوازە، چونکە ئەو سەبرو ئارامی وخۆراگرییەی لەگەڵ منداڵ لەلایەن مامۆستایانی قوناغی سەرەتاییدا هەیە و بەدی دەکرێ، لەلایەن مامۆستایانی قوناغی ناوەندی و دواناوەندیدا نیە. دەتوانن تاقی بکەنەوە کەوا ئەو بابەتانەی مامۆستایانی سەرەتایی دەتوانن بە رێگاو شێوازی تایبەتی بیگەیەننە قوتابی، جیاوازە لەگەڵ شێوازی مامۆستایانی ناوەندی و دواناوەندی هەروا بە پێچەوانەوەش .

بەڵام خۆ ئەم پرۆگرامە نوێیە هەر قۆناغەو مامۆستای ڕێبەری خۆی هەیە، ئاخۆ ئەم مامۆستا بەرێزە ڕێبەری مامۆستای پۆلی دووەمی خوێندۆتەوە تا بزانێ چۆن وانەکە وبە چ شێوازێك بۆ کوڕەکەی روون بکاتەوە، یا هەروا سەیری پەرتووکەکەی کردووە، تا بەو شێوازەی کە خۆی پێی باشە ئاوا بیگەیەنێتە منداڵەکەی .

کەواتە لەبەرئەوەی خۆی کارەکەی بە تەواوی ئەنجام نەداوە، نەك لەبەر زەحمەتی پرۆگرامەکە، بۆیە بەزەحمەت توانیویەتی منداڵەکەی فێربکات.

قوتابی کە مامۆستای خۆی هەبوو پیویستی بەکەسی تر نابێ، خۆ ئەگەر پێویستیشی بەوە هەبوو کەسێکی تر وانەی پێ بڵێتەوە دەبێ ئەو کەسە (ڕێبەری مامۆستا) بخوێنێتەوە ئینجا هەنگاوی فێرکردن بنێت.

- مامۆستای زۆر ڕێزدار و هێژا مامۆستا عەبدوللەتیف شەریف دەفەرموێ :
(قوتابخانەکانی ئەوان (مەبەست هەندەرانە) هەموو جۆرە پێداویستیەکانی خوێندنی تێدا بەدی دەکرێ، لە هۆیەکانی فێرکردن و کورسی دانیشتن و تەختەی نووسین و تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەرو ...هتد.)

لە مامۆستای بەرێز دەپرسین: ئایا لە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاری واتە ( ریاضیات معاصرة) سیستەمەکە چۆن بوو مامۆستا ئاوا دەقاو دەق بەکاری دەهێنا ؟! یاخود مامۆستا (ڕێبەری مامۆستای) لە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاری کە هەبوو بەکاری دەهێنا ؟ ئەگەر نا ئەی بۆچی ئاشنایی لەگەڵ ئەو ڕێبەرەدا دروست نەدەکرد، تا لە هەموو کات پێی بێت و لەوەختی خۆیدا بەکاری بێنێ !!؟.

خۆ له پرۆگرامی (ریاضیات معاصرة) لـه پـەرتووکی مامۆسـتا روونـی کردبـۆوه هۆیەکانی فێرکردن لەچەند جانتایێك پێك دێت و مامۆسـتا و قوتـابی دەبـێ جانتـای هۆیەکانی فێرکردنی خۆیان هەبێ. بەپێی هەر قۆناغێکی خوێندن بـەکاری بێـنن بـۆ نموونه :

سیستەمە کۆنەکەی بیرکـاری بـۆ قوتابییـانی پـۆلی دووم (١٢) جانتـای هۆیـەکانی فێرکردنی داناوه و هەریەکەیان کۆمەڵێك هۆیەکانی فێرکردنی تایبەتی له خۆ دەگرێ. بەپێی ناوەڕۆکی بابەتەکانی ناو پەرتووکەکە وەکو :

- جانتای (١): کۆمەڵەی بەرجەستەکان ( مجموعة مجسمات )
- جانتای(٢):کۆمەڵەی ناوچه رووتەختەکان ( مجموعة مناطق مستوية)
- جانتای (٣): کۆمەڵەی چەماوەکان ( مجموعة منحنيات)
- جانتای (٤): تابلۆی ئەندازەیی ( اللوحة الهندسية )
- جانتای (٥):پارچه دراوه خۆجێیەکان (وحدات النقود المحلية )
- جانتای (٦): پارچه دراوی کەنداوییەکان (وحدات النقود الخليجية )
- جانتای (٧): پارچەکانی دنیز (١) ( قطع دنيز (١)
- جانتای (٨): پارچەکانی دنیز (٢) ( قطع دنيز (٢)
- جانتای (٩): ژمێرەری ئاسایی (معداد معتاد)
- جانتای (١٠): ژمێرەری لێکدان (معداد الضرب)
- جانتای (١١): هۆیەکانی پێوان (وسائل قياس)
- جانتای (١٢): تەنه ناوچەییەکان (أجزات المناطق)

ئەم دوانزە جانتایەی هۆیەکانی فێرکردن تایبەتن بە پۆلی دووەم بۆ مامۆستاو قوتابی. (٣٦) سی وشەش ساڵە ئەم پرۆگرامە دەخوێنرێ . کێ تا ئێستا ئەم جانتایانەی هۆیەکانی فێرکردنی بەکار هێناوە یا خود بینیویەتی؟ ئێستاش ئەگەر پرسیار لە مامۆستایان بکەین پارچەکانی(دنیز) یانی چی هیچی لێ نازانن، هۆی نەزانینەکەشیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەکاریان نەهێناوە و لەبەر دەستیان دا نەبووە و هەر ناویشیان نەبیستووە. کەچی وێنەکەشی لە پەرتووکی قوتابی دا هەیە و کەسیش نەیزانیوە ئەوە پارچەکانی دنیزە:

کەواتە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاری جانتای هۆیەکانی فێرکردنی بۆ قوتابییان دانابوو، واتا دەبوایە قوتابی بۆ هەموو بابەتەکانی خوێندنی بیرکاری جانتای هۆیەکانی فێرکردنی خۆی هەبێ، بۆ ئەوەی لەکاتی خوێندنی هەر بابەتێك قوتابییش وەك مامۆستا جانتای خۆی لەبەردەمی خۆی دابنێ. کاتێ مامۆستا وانەکە روون دەکاتەوە ئاواش قوتابی لەگەڵ مامۆستا کارەکە ئەنجام بدات. بەڵام کەهۆی فێرکردنەکان وەك لەڕابەری مامۆستادا دیاری کراوە و بەکار نەهێنراوە ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە، کە نازانین خەتای کێیە !

کەواتە دەپرسین بەکارنەهێنانی جانتای هۆیەکانی فێرکردنیش رەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە نەتوانرا ئەم هەموو جانتایە بۆ قوتابییان و مامۆستایان دابین بکرێ، بەڵام ئێستا لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا، قوتابی و مامۆستا بە ئاسانی هۆیەکانی فێرکردنی بیرکاریان لە دەوروبەرو ژینگەی خۆیان دەست دەکەوێت و هیچ گرفتێکی وای نیە .

تەنانەت لە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاریدا، رێبەری مامۆستاش بەکار نەهێنراو بەدەست نەدەکەوت، ئەگەر بەدەستیش کەوتبا ئەوا بەزمانی عەرەبی بوو کەوا زۆر چاك دەزانین مامۆستایانی هەرێمی کوردستان، بەتایبەتی ئەو مامۆستا بەرێزانەی تازە دەرچوون، زۆر چاك عەرەبی نازانن ئەوا وای دابنێین کە ئەوانەی عەرەبیشیان دەزانی، تووشی گرفتێکی تر دەبوونەوە کە (پەرتووکی قوتابی) بە کوردی و (رێبەری مامۆستا) بەزمانی عەرەبی بوو، ئەوەشیان تارادەیەك چارە دەکرا بەڵام لاپەڕەی (پەرتووکی قوتابی) لەگەڵ (رێبەری مامۆستا) کەدا رێکنەدەکەوتەوە، بۆیە:

مامۆستا زۆر هیلاك دەبوو و توانای گەڕانی نەدەما چونکە هەموو کاتەکەی بە دوای دۆزینەوەی لاپەڕەی بابەتەکە لە (رێبەری مامۆستا) دا سەرف دەکرد. تا دەگەیشتە ئەنجامەکەی بەڵام ئەم ماندووبوون و گەڕانە، وای لە مامۆستا دەکرد جارێکی تر خۆی تووشی ژانە سەرنەکا و بە ناچاری دەچوو هەر سەیری لاپەڕەی (پەرتووکی قوتابی) دەکردوو بەو شێوازەی کەخۆی پێی چاك بوو چۆن تێی دەگەیشت ئاوا بابەتەکەی بۆ قوتابییان روون دەکردەوە.

بەڵام ئێستا مامۆستا لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاری تووشی ئەو وەرەزی و بێزاربوونە نابێ، چونکە لاپەڕەی (پەرتووکی قوتابی) ژمارەی لاپەڕەی یەکسانە لەگەڵ (پەرتووکی مامۆستا) دا وەکو یەکەو وێنەی لاپەڕەکەش لە(پەرتووکی مامۆستا) دا بەشیکارو وەڵامی ڕاستەوە هەیە، کەواتە مامۆستاش دەحەسێتەوە بەبێ دڵە ڕاوکێ وانەکە بەشێوازێکی جوان دەڵێتەوە.

- لە شوێنێکی تردا دەفەرموون :

(بۆ هەر پۆلێك ٤ کتێب چاپکراوە ، ٢ بۆ قوتابییان و ٢ بۆچالاکی جگە لە کتێبی ماملۆستا پێشتر دوو کتێب بۆ هەر پۆلێك هەبوو، یەکێکیان بۆ چالاکی کە زۆر گرنگ بوو چونکە ٣ جۆر پرسیاری تێدا بەدی دەکرا و بۆ قوتابییە بەهرەدارەکان کەتەنها ئەوان شیکاریان دەکرد، بۆ ئەوەی ئاستیان زیاتر بەرز بێتەوە. جۆری دووەمیش بۆ قوتابییە دواکەوتووەکانە تا بگەنە ئاستی ئەوانی دیکە، سێیەمیش بۆ سەرجەم قوتابیەکانە، کە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. لە قوتابخانەکاندا تەنها یەك کتێب دەخوێندرا زۆر قوتابخانەش تەنها کتێبی چالاکییان دەخوێند).

لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین :

راستە بۆ هەر پۆلێك چوار پەرتووك چاپکراوە (٢) دوو (پەرتووکی قوتابی) و (٢) دوو( پەرتووکی ڕاهێنان ) نەك ( دوو ) پەرتووکی چالاکی کە بەرێزتان باسی دەکەن. (پەرتووکی ڕاهێنان) لە جیاتی دەفتەر بەکاردەهێنرێ لە پۆلدا نەك وەکو (کتێبی چالاکی)، هەروەها سەبارەت بە بەکارنەهێنانی (پەرتووکی چالاکی) لە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاریدا، دەبوایە هەموو ساڵێ قوتابی (پەرتووکی چالاکی) وەربگرێ، چونکە ئەم پەرتووکە هەندێك جار داوای لە قوتابی دەکرد، بۆ بڕینی زۆرینەی وێنە ئەندازەییەکان یاخود هەر وێنەیەکی تر مقەست بەکاربهێنێ، یا جاری وادەبوو لاپەڕەیەکیان هەر بەتەواوەتی لێ دەکردەوە. ماملۆستا چاوی لێدەکرد و هەڵەکانی بۆ ڕاست دەکردنەوە.

لە ماوەی ئەو چەند ساڵەشدا کەمن ماملۆستای ئەو بابەتەم تا ئێستا کتێبی چالاکیم بەدەست ماملۆستاو قوتابییەوە نەدیوە. بەڵام سەبارەت بە هەردوو (پەرتووکی قوتابی)

و (پەرتووکی ڕاهێنان)، هیچ قورساییەکی تێدانیە  قوتابی لەجیاتی ئەوەی دەفتەرێك بۆ وانەی بیرکاری تەرخان کا و نموونەی سەر تەختەرەش و ( پەرتووکی قوتابی ) نەقڵی سەر دەفتەر بکات . قوتابی دەفتەرێکی ئامادەی لەبەر دەست دادەبێ بێ ئەوەی تووشی وەرەزی و بێزار بوون بێ لەکاتی شیکار کردنی پرسیارەکان و کاتێکی زۆریش بەنووسینەوە سەرف بکات. ئەوا یەکسەر (پەرتووکی ڕاهێنان) زۆر بەجوانی جێگای شیکارکردنی پرسیارەکانی بەجێ هێشتووە، قوتابی تەنیا وەڵامی پرسیارەکەی لەسەر دەنووسێ کەواتە ئەرکێکی زۆری لەسەر قوتابییان کەم کردۆتەوە. وە نابێ لەسەرەتاوە حوکوم بدەین کێ ناڵێ هەر دوو (پەرتووکی قوتابی) دەبێ بەیەك پەرتووك  و هەر دوو (پەرتووکی ڕاهێنان) دەبێ بەیەك پەرتووك. کێ ناڵێ لەبەر نەبوونی کاتی گونجاو بۆ تەرجەمەکردن، کراوە بە دوو بەرگ تا بە زوویی بگاتە دەست قوتابی و مامۆستا.

- لە شوێنێکی تردا بەڕێزیان دەفەرموون:

( لەلاپەڕە (٢) زنجیرەی پەرتووکە کەدا نامەیەك بۆ کەس وکاری قوتابییان هاتووە، منداڵەکانیان فێری جووت بوون لە نێوان دوو کۆمەڵەدا بکەن). لێرەدا دەپرسم بەڕێزان کەس و کاری منداڵەکان دەزانن جووت بوون چییە؟).

- خۆ نووسینی ئەم نامەیە بۆ کەس وکاری قوتابییە واتا کەس وکاری قوتابی لەسەرەتای هەر بەشێك ئاگادار دەکاتەوە، کە لەم بەشەدا قوتابی فێری ئەو شتانە دەبێ  بۆ ئەوەی ئەوانیش لە ماڵەوە ئاگاداربن، تا بزانن منداڵەکانیان لەسەر ئەو شتانە هەڵبسەنگێنن کە لە قوتابخانە وەریان گرتووە تا چەند لەو بابەتە فێربوونە ؟

- هەروەها بەرێزیان دەفەرموون:

(لەبەرامبەریشدا باوکی قوتابی و کەس وکاری سوودی لێ وەرناگرن، چونکە زۆر بەیان خوێندەوارییان نییە، خۆ ئەگەر خوێندەواریش بن ئەوە بایەخی پێ نادەن. خۆ ئەگەر بۆ مامۆستاش بێت هەمان ناوەڕۆك بەدرێژی لە پەرتووکی مامۆستا نووسراوە، واتە زیادەیە).

ئێمە پێمانوایە: ئەگەر دایك و وباوکی قوتابی نەخوێندەواریش بوون، ئەوا خۆ مامۆستا نامەکە بۆ قوتابییەکانی دەخوێنێتەوە و پێیان واژوو دەکات کە ماڵەوە ئاگادار بکەنەوە. بەڵام خۆ هەموو دایك وباوکەکان نەخوێندەوارنین .

خوێندەواریش هەیە و نیمچە خوێندەواریش هەیە. نابێ خوێندەواری و نەخوێندەواری بکەینە پێوەر. دەبێ تەماشای چەند ساڵێکی تر بکەین .

ئەی دەپرسین دەوری سەرپەرشتیارانی پەروەردەو مامۆستایان و بەرێوەبەری قوتابخانەکان چیە؟ تا بتوانن دایك و باوکی قوتابی لەسەر ئەم سیستەمە نوێیە رابهێنن و ئاگاداریان بکەنەوە، بەتایبەتی لەکاتی کۆبوونەوەی دایکان و باوکانداو باسی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم سیستەمە نوێیەیان لەگەڵدا بکرێ، ئەگەر بۆ کەمێکیش بێت. تا بەرە بەرە ڕادێن. کەواتە نووسینی ئەم نامەیە وادەکا، پەیوەندی نێوان مامۆستاو دایك وباوکی قوتابی و قوتابخانە پتەوتربێ، چونکە دەزانن لە خوێندنی ئەم بەشەدا ئامانجییان چییە؟.

سەبارەت بە جووت بوونیش لەنێوان دووکۆمەڵەدا هەر زۆر ئاسانە، چونکە جووت بوون بەکاردەهێنرێت بۆ دیار کردنی دوو کۆمەڵەی یەکسان لە ژمارەدا. کەواتە ئەگەر قوتابی دوو کۆمەڵەی جیاوازی هێنا، واتە کۆمەڵەی گوڵەکان و کۆمەڵەی گوڵدانەکان

ئەگەر بەقەد یەك بوو ئەوا جووت دەبن ئەگەر بەقەد یەك نـەبوو ئـەوا جـووت نـابن. کەواتە زەحمەتییەکەی لەچی دایە .

- لە شوێنێکی تردا بەڕێزیان دەفەرموون:

- (دیسان دەپرسم کەس وکاری منالّەکان دەزانن کۆمەلّە چییە؟).

خۆ ئێستا ئێمە لەسەردەمانێکی تردا دەژین پێم وانیە کەس نەزانێ وشـەی کۆمەلّـە چییە تەنانەت بەرگوێشم کەوتووە کەبەکاریان هێناوە (کۆمـەلّێك گـولّ ، کۆمـەلّێك پیالّە ....هتد ) کە نەخوێندەواریشە تەنانەت ئـەو کۆمەلّگایـەی کـە ئێمـەی تێـدا دەژین کۆلّەوارنین، بـەلّکو چـینی ڕۆشـنبیرو مامۆسـتاو دکتـۆر و قوتـابی زانکـۆ و فەرمانبەر و ئەوانەمان هەمووی هەیە، خۆ لە سـفرەوە دەسـتمان پـێ نـەکردووە تـا نەزانین کۆمەلّە چییە، ئەمڕۆش هیچ مالّێك بێ چەند خوێنـدەوارێك نیـە، هەرنـەبێ خوێندەوارێکی تێدایە، ئەگەر نەشبوو ئەوا مامۆستا وەك تای تەورداس ڕاوەستاوە.

- لە شوێنێکی تردا بەڕێزیان دەفەرموون :

(چەند قوتابی دەزانێ ژمارەکانی خۆبەش و دابەش چییە؟).

ئێمە دەبێ بپرسین ئایا لە سیستەمە کۆنەکەدا، قوتابییان دەیانزانی ژمارەی دابەش و ژمارەی خۆبەش چـییە ؟! ئێسـتا ئەوانـەی لەسـەر سیسـتەمە کۆنەکـە بیرکارییـان خوێندووە بگرە بەرەو وپۆلەکانی (٧و٨و٩و١٠) و تا کۆلیژەکانیش، تاك تاکـە نـەبێ دەنا زۆربەی هەرە زۆریان بەتەواوەتی نازانن پێناسەیەکی تەواوی ژمـارەی خۆبـەش و ژمارەی دابەش بکەن، تەنانەت ئەگەر پرسیار بکەی لەچـەند مامۆسـتایەکیش بلّێـی ژمارە (١) دابەشە یا خۆبەشە لەوانەیە هەندێکیان بلّێن خۆبەشە و هەنـدێکیان بلّـێن دابەشە؟

چەند جارێك ئەو پرسیارەم لەگەڵ مامۆستایاندا مناقەشە کردووە. دەربارەی ژمارە (یەك) بەڵام بەداخەوە دەڵێم ناتوانن هۆیەکەی بۆ قوتابییان روون بکەنەوە کە ژمارە (یەك) بۆچی نەخۆبەشە و نەدابەشە.ئەوە لە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاری دایە.
بەڵام لەسیستەمە نوێیەکەدا هەروەکو لە ئەلقەی یەکەمدا روونکراوەتەوە کە تەمەنی ( پەرتووکی بۆ هەمووان ) یەك ساڵە. زۆر بەجوانی ئەم گیروگرفتانەی تێدا روونکراوەتەوە هۆیەکەشی بۆ مامۆستایان دیار دەکات.

- مامۆستای زۆر رێزدار و هێژا مامۆستا عەبدوللەتیف شەریف لە خاڵێکی تردا دەفەرموێ:
(چەند قوتابی دەزانن ژمارەی تاك و ژمارەی جووت چییە؟ چەندیان دەزانن ژمارەی تاك + ژمارەی تاك ژمارەیەکی جووتی دەست دەکەوێت ...هتد)

ئەگەر بێین سەیری (پەرتووکی قوتابی) لە پۆلی دووەمدا بکەین، لەبەشی دووەم وانەی چوارەم لەلاپەڕە (٢٥) دا، هەروەها(پەرتووکی مامۆستا)ش لەلاپەڕە (٢٥) دا، زۆر بەجوانی ژمارەی تاك و ژمارەی جووتی روونکردۆتەوە، کەواتە قوتابی جیاوازی نێوان ژمارەی تاك و ژمارەی جووت لەپۆلی دووەم دا فێردەبێ، نەك لە پۆلی سێ دا. قوتابی لەپۆلی سێیەمدا فێری (بەراوردکردنی ژمارەکان و ڕیزکردنی ژمارەکان و نزیکردنەوەی ژمارەکان) دەبێت. جاران لە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاریدا قوتابی لەپۆلی پێنجەمدا فێری تاك وجووت و کۆکردنەوەی دوو ژمارەی تاك، یا کۆکردنەوەی ژمارەیەکی تاك لەگەڵ ژمارەیەکی جووت یا کۆکردنەوەی دوو ژمارەی جووت ویا ژمارەی خۆبەش و دابەش دەبوو. لەپۆلی چوارەمیشدا فێری نزیك کردنەوە و بەراوردکردنی ژمارەکان دەبوو. واتا پێش ئەوەی بزانێ ژمارەی تاك + ژمارەی تاك =

ژمارەیەکی جووت. کەواتە لـە سیسـتەمە کۆنەکـەی بیرکـاری دا، قوتـابی لـەپۆلی پێنجەم دا فێری ژمارەی تاك و ژمارەی جووت دەبوو .

دەپرسین زۆر درەنگ نیە تا قوتابی لە پۆلی پێنجەمدا فێری ژمارەی تـاك و ژمـارەی جووت بێ؟ ئەو هەموو قۆناغـە ببڕێ تا دەگاتە پۆلی پێنجەم ئینجا بزانێ ژمارەی تاك و ژمارەی جووت چیە؟! ئێستا بیرۆکەی فێرکردنەکان یـەك بـەدوای یەکدایـەو قۆنـاغ دوای قۆناغـە و لەسەر شێوازێکی ڕێك وپێك و نوێ قوتابی فێردەکات .
خۆ ئەگەر بەرێزیشیان مەبەستیان لەفێرنەبوون و نەزانینی ژمـارەی تـاك و ژمـارەی جووتی پـۆلی سـێهەمی ئەمسـاڵە، ئـەوە لەبـەر ئەوەیـە کـە ئـەم پـۆلی سـێهەمە زووترلـەپۆلی دووەم دەربـاز بـووە و چـۆتە پـۆلی سـێهەم و بەسیسـتەمە تازەکـە ڕانەگەیشتووە تا فێری ببێ ... خۆ ئەگەر قوتابییانی پۆلی دووی سیستەمە نوێیەکە بگەنە پۆلی سێهەم، ئەوا مامۆستا دڵنیا دەکەمەوە کە تاك و جووتێکی زۆر پوخـت ونەخت دەزانن. هەروەها هۆی تریش هەن وەك: خراپی شێوازی گوتنەوەی فێرکردنەکە کە بەتەواوی نەگەێنراوەتە قوتابی، نەك خراپی سیستەم و پڕۆگرامەکە.

- لە شوێنێکی تردا بەڕێزیان دەفەرموون:
( لە پەرتووکی (بیرکاری بۆ هەمووان)دا، بەشێوەیەکی یەکجار فراوان بایەخ بەدراو و کات دراوە، کە ئەم دوو بابەتە منداڵان پاش ماوەیەکی کەم فێری دەبن، چونکە هـەر دووکیان لە ژیانی ڕۆژانەیدا مامەڵەی پێدەکات لە فرۆشگای قوتابخانەو دەرەوەیدا).
منیش لەگەڵ ئەو بۆ چوونەی بەرێزیانم کە قوتابی ئەم دوو بابەتـە بەماوەیـەکی کـەم فێردەبێ. بەڵام خۆ فێربوونەکەی جاران کە لە سیسـتەمە کۆنەکـەی بیرکاریـدا فێـری دەبوو جیاوازە: ئێستا قوتابی بەگوێرەی ئەم سیستەمە نوێیەی بیرکاری قوناغ بەقوناغ

فێردەبێ، واتا بە شێوازێکی زۆر زانستیانەو ورد، هـەموو بەشـەکانی خوێندنـەوەی (کات ژمێر) فێردەبێ کە جاران بەو جۆرە نەبوو. راستە قوتابی فێـر دەبـوو بـەڵام چ فێربوونێك تەنانەت پاش نیوەڕۆ و پێش نیوەڕۆی جیا نەدەکردەوە نەیدەتوانی چۆنیەتی نووسینی کات، بە کاتژمێر بنووسێ.

جاری وا هەبوو فاریزەی دادەنا لەبری ئەوەی ( : ) دوو خاڵ لەسەریەك دابنێ بۆ نموونە:

ئەگەر بمانگووتبایە بۆمـان بنووسـە (کاتـژمێر سـێ و پـانزە خولەکـە) بـەم جـۆرەی دەنووسی ٣,١٥ ئەوەش هەڵەبوو. چونکە بەوقوڵییەی کەئێستا دەخوێنرێ ئاوا نەبوو. لە سیستەمە کۆنەکەی بیرکاریـدا، بەشـەکانی کۆتـایی پەرتووکەکـە باسـی کـات و فێربوونی کاتژمێری دەکرد، یانی کەوتبووە بەشـەکانی دواوەی کتێبەکـە. ئـەوە بـوو هەندێ قوتابخانە بەوەڕانەدەگەیشتن کە ناوەڕۆکی پەرتووکەکـە تـەواو بکـەن، کەواتـە قوتابی لە فێربوونی کاتژمێردا بی بەش دەبوو. بەڵام ئێستا قوتـابی فێردەکـات بـەو شێوازە بنووسێ (٣:١٥) سێ و پانزە خولەك پاش نیوەڕۆ. کەواتە قوتابی فێردەکات بە کاتەکەوە پێش نیوەڕۆ و پاش نیوەڕۆ بزانێ.

مامۆستای بەرێز: ئێستا شێوازی یەکجار زۆ بەکار هێنراوە بۆ فێربوونی کات کە لـە پۆلی یەکەمەوە بۆ پۆلی دووەم و لە دووەمەوە بۆ پۆلی سێیەم دەگۆڕێ .

قوتابی لەپۆلی یەکەمدا بەشەکانی کاتژمێر دەناسێت و خوێندنەوەی کاتژمێر لەسەر کاتژمێرەکە فێردەبێ و چۆنیەتی نووسینی کاتیش بەکاتژمێرەکە.

بەڵام لە پۆلی دووەمدا قوتابی فێری خوێندنـەوەی کاتـژمێر بـە چـارێکەك، زانینـی کاتەکانی پێش نیـوەڕۆ و کاتـەکانی دوای نیـوەڕۆ دەبێـت. خوێندنـەوەی ڕۆژژمێـر، نواندنی گوژمەی دراو بەڕێگای جیاواز، دۆزینەوەی کات بە کاتژمێر و نیو کاتژمێر.

بەلاّم لە پۆلی سێیەمدا قوتابی فێری خوێندنەوەی (کاتژمێر) بە خولەك و دۆزینـەوەی دەمـی نێوان دووکات بە خولەك، گۆرینی دراو لەنێوان پارچە جیاوازەکان و کاغەزە دراوەکاندا.
بەلاّم لە پۆلی چوارەمدا قوتابی فێری خوێندنەوەی دەم بەچرکە، دۆزینەوەی کـات بـە بەکارهێنانی (کاتژمێر)، کۆکردنەوەی دراو ولیَ دەرکردنیان دەبێت .
کەواتە فێربوونی لەسـەر شـێوازی سیسـتەمە نوێیەکـەی بیرکـاری، فێربـوونێکی پوخـت و زانستیانەیە، قوتابی فێری هەموو خوێندنەوەکانی کاتـژمێر دەکـات بـە بەشـەکانی کـات و نووسین و خوێندنەوە ونیو چارێك و چرکەو خولەکەوە، بەلاّم هەنگاوبەهـەنگاو نـەك لـەپۆلّێك هەموبەشەکانی کاتژمێری فێربکرێ .کەواتە فێربوونەکە بەگوێرەی هزری قوتابی دەبیَ.

هەروەها سەبارەت بـە دراویـش، بـەم شـێوەیەی کـە کاتـژمێری پـیَ روونکراوەتـەوە قوتـابی هەمووبەشەکانی دراو فێردەبیَ و بەراوردی نێوان دراوەکان و ئالّوگۆرکردنیان و کەمترو زۆرتر و لیَ دەرکردن و کۆکردنەوەیان فێردەبی (دەکات). بەرای ئێمەش ئـەم جـۆرە فێربوونـە فێربـوونێکی زانستیانەی رووت و پوختە، کە قوتابی فێردەبیَ و لەبەری دەحەسێتەوە، چونکە ئێستاش ئەوەی بەسیستەمە کۆنەکە فێرکـراوە چـرکەو خولـەك وچـارەکە تێکـەلّ وپێکـەلّ دەکـات، هەشمانـە نەخوێندەوارە بەلاّم دەزانیَ کاتژمێر بخوێنێتەوە بەلاّم بەم شێوازە زانستیانە نا.

- لە شوێنێکی تردا بەرێزیان دەفەرموون:
(چەند قوتابی دەزانیَ هاوجیَ بوون چییە؟)
سیستەمە کۆنەکەی بیرکاری زۆر بەجوانی روونی نەکردبۆوە، کە هاوجیَ بـوون چـیە، کە قوتـابی لـەپۆلی شەشـەم دا وەری دەگـرت زۆر بـەگرانی فێـری دەبـوو، چـونکە روونکردنەوەکەی روونکردنەوەیەکی وانەبوو بۆ مامۆسـتا تـا قوتـابی بـەجوانی فێـر بکات.

بەڵام ئێستا لە سیستەمە نوێیەکەی بیرکاریدا لە پەرتووکی پۆلی دووەمدا، زۆر بەجوانی لە بەشی حەوتەم بەرگی یەکەم لەلاپەڕە (٩) دا، باسی هاوجێبوون و جووت بوون دەکات، هەروەها لە لاپەرەی(٩٩) ی (پەرتووکی مامۆستا) شدا، روونی کردۆتەوە کە چۆن هاوجێ بوون لە قوتابییان دەگەیەنرێ وبۆچی فێری ئەم بابەتە دەبین؟ هێڵی هاوجێ بوون بەکاردەهێنرێ بۆ دابەش کردنی شێوەیەکی ئەندازەیی بۆ دووبەشی یەکسان.

هەروەها لە پێشینەی بیرکاری دا هاتووە .

شێوە ئەندازەییەکان جووت دەبن، ئەگەر هەمان شێوەو هەمان پێوانەیان هەبێت. هەروەها جووت دەبن ئەگەر یەکێکیان بخرێتە سەر ئەوی تریان. شێوە ئەندازەییەکان هاوشێوە دەبن ئەگەر هەمان شێوەیان هەبێت، وە سەرنجی قوتابییان ڕادەکێشم بۆ هێڵی هاوجێ بوون کە لاکێشەکە دەکات بەدوو بەشەوە، ئەو هێڵەش شێوە ئەندازەییەکە دەکات بە دوو بەشی جووت بوو. جووت بوون کاتێك دەبێت کە شێوە ئەندازەییەکە دەنوشتێنیەوە بەپێی هاوجێ بوون. مانای ئەو دوو بەشەی هەمان شێوەو هەمان پێوانەیان هەبێت.

هەروەها لە(پەرتووکی بەرەنگار) (٧- ٢) لە لاپەڕە (٣٧) کە پیتەکانی ئینگلیزی هێناوەتەوە، زۆر بەجوانی هاوجێ بوون و جووت بوون دیار دەکات. کەواتە ئەگەر بەو شێوازەی روونکراوەتەوە، مامۆستا بەجوانی بیگەیەنێتە قوتابییان، چۆن قوتابییان نازانن هاوجێ بوون چیە.

- لە شوێنێکی تردا بەڕێزیان دەفەرموون :

لەلاپەڕە (١٨١) هاتووە: سالار (٤٨١) کـارتی لایـە، (٢١٨) کـارتی لێ فرۆشـت. (١٥٦) کارتی تری کڕی، سالار چەند کارتی هەیە ؟

بۆ تێ گەیشتن بە ئاسانی لەم پرسیارە، شـیکار کـردن و یـاخود ڕوونکردنـەوەی بـۆ قوتابییان، دەبێ وابێ کە لە نموونەی ئاسانەوە بۆ تێ گەیاندنی قوتابی بچـین، ئینجـا دەست بکەین بەشیکار کردنی پرسیاری لەم جۆرە، ئەوەش دەبێ بە ڕوونکردنەوەیەکی چاك لە لایەن مامۆستاوەو بەستنەوەی بابەتەکەوە بێ بەژیانی ڕۆژانەی قوتابییانەوە.

کەواتە بۆ ئەوەی سەرنجی قوتابی بۆ پرسیارەکە ڕاکێشـین. یـەکێك لـە قوتابییـەکان بانگ دەکەین. دەڵێین ئەحمەد پێنج دەستەبنێشتی پێیە، پاشان دەڵـێین ئەحمـەد سـێ دەسـتەی لێ فرۆشـت، پاشـان چـوار دەسـتە بنێشـتی تـری کـڕی، ئەحمـەد چـەند دەستەبنێشتی پێیە؟ تا لە مانای پرسیارەکە بەتەواوی تێ بگەن، ئینجـا بـۆ خۆیـان دەست دەکەن بەڕێگاو شێوازی شیکارکردنی چۆنیەتی پرسیارەکە.

لەشوێنێکی تردا هەر لەسەر هەمان پرسیار دەفەرموون:

(کە قوتابی نازانێ پرسیارەکە بخوێنێتەوە، ئەگەر بشیخوێنێتەوە ئەوا پچڕ پچڕو برگە برگەیە، تەنها ئاگـای لەوەیەکـە پرسـیارەکە بخوێنێتـەوە ، دەنـا لـەماناو داواکـاری پرسیارەکە ناگات).

جارانیش لە سیستەمە کۆنەکەدا، قوتابی دەگەیشـتە پـۆلی شەشـەمی سـەرەتایی و یەکەمی ناوەندی، نەیـدەتوانی پرسـیارە چـیرۆکییەکان بخوێنێتـەوە یـاخود لـەمانای پرسیارەکە بگات. بەڵام لەم سیستەمە نوێیـەدا، هـەر لـە سـەرەتاوە قوتـابی فێـری دایەلۆگ دەکات و فێری پرسیاری چیرۆکی دەکات. جاران قوتابی ئەگـەر پرسـیارێکی چیرۆکی دەهاتە پێشی (١٠) جاریش بیخوێندبایەوە، نەیدەزانی کۆکردنەوەیـە یـاخود کەم کردنەوە یا لێکدان یا دابەشە. جا نەك هـەر قوتـابی تەنانـەت جـاری وا هـەبوو

ماموٚستاش لە دارِشتنی پرسیارەکە نەدەگەیشت و ناچار پرسیاری لەم ولەو دەکرد ئەوەش چەند روٚژێکی دەخایاند. هەندێ جاریش کە ماموٚستا خوٚی لە پرسیارەکە نەدەگەیشت شیکاری پرسیارەکەی بەجێ دەهێشت و نەیان دەخوێند.

بەلاٚم ئێستا ماموٚستا پێویستی بەوەنیە پرسیار لەم ولەو بکات یاخود بشلەژێ، یەکسەر پرسیارەکە بوٚ قوتابییان روون دەکاتەوە ئەوەش ماموٚستا دەتوانێ رێ نیشاندەر بێ، چەند جارێك پرسیارەکە بوٚ قوتابی بخوێنێتەوە تا رِایان بهێنێ، پاشان پرسیار لە قوتابییان بکات کە تا چەند لە پرسیارەکە گەیشتوون و بوٚی بگێرِنەوە. بوٚ ئەوەی ماموٚستا لەوە دلنٚیابێت کە قوتابییەکانی لەمانای پرسیارەکە گەیشتوون ئینجا دەست دەکەن بەشیکارکردن. ماموٚستاش پشت ئەستوورە بە (پەرتووکی ماموٚستا) کە پرسیارەکەی بەجوانی تێدا شیکار کراوە، کەواتە دەستە و وەستان نابێ و قوتابیش رِا دێ ولە گرفتی زانینی خوێندنەوەو نەخوێندنەوەو پچرِپچرِی رزگاری دەبێ.

لێرەدا ئەوەندە ماوە بلێٚم ئەگەر حەز بە تەمبەلیٚ نەکەین و توٚزێك لەگەلٚ (پەرتووکی ماموٚستا) دا خەریك بین و بخوێنینەوە سیستەمەکە زوٚر بەجوانی دەرِواو گرفتی نابێ. بەلاٚم ئێمە وا رِاهاتووین بێ بایەخ پێدان کارەکان ئەنجام بدەین و بێ ئەوەی خوٚ ماندووبکەین. بە دلنٚیاییەوە ئەمەش نەخوٚشییەکی گوشندەیە رووبەرووی پروٚسەی پەروەردەو فێرکردن بوٚتەوەو دەبێتەوە و تائێستاش هەر بەردەوامە . ♥

---

♥ بە سێ بەش لە روٚژنامەی خەبات دا بلاٚو کراوەتەوە .

١- بەشی یەکەم لە بەرواری ٢٠٠٨/٩/٩ ژمارە ( ٢٩٦٦) لاپەرِی کاروباری کوٚمەلاٚیەتی

٢- بەشی دووەم لە بەرواری ٢٠٠٨/٩/١٠ ژمارە ( ٢٩٦٧) لاپەرِی کاروباری کوٚمەلاٚیەتی

٣- بەشی یەکەم لە بەرواری ٢٠٠٨/٩/١٦ ژمارە ( ٢٩٧٣) لاپەرِی کاروباری کوٚمەلاٚیەتی

* تێبینی/ ٢٠١٣/٦/٩ دیزان و پیت چینینەکەی تەواوبووە / شوارێ.